زنجیرەی ڕێنماییەكانی ڕێگای ڕاست
(٦٨)

# تێـــڕوانینی سەید قطب بۆ هاوەڵانی پێغەمبەر ﴿صلى الله عليه وسلم﴾

نوسینی
شێخی پایەبەرز
ربیع بن هادی عمیر المدخلی

لە كتێبی (العدالة الاجتماعیة)ی سەید قطب چاپی یازدەهەمی

وەرگێڕانی
عثمان أحمد
پێداچوونەوەی
مامۆستاخلیل أحمد

چاپی یەكەم ١٤٣٣ كۆچی

==================================

لە بڵاوكراوەكانی

 ماڵپەڕی بەهەشت 

www.ba8.org

 islam_kurd_ba8@yahoo.com

 07701517378

عێراق - كوردستان - كەلار

هەمیشە لەگەڵمان بن بۆ بەرهەمی نوێ

كتێبی ژمارە ﴿١١٠﴾

## مۆڵەتپێدانی نووسەر بە وەرگێڕانی کتێبەکانی

بەناوی خودای بەخشندەی میهرەبان

سوپاس و ستایش بۆ پەروەردگاری هەموو دروستکراوەکان و درود و سڵاو لەسەر بەڕێزترینی پێغەمبەران و نێردراوانی خودا وە لەسەر ئەهل و هاوەڵانی :

ڕوخسەتم دا بە هەریەکە لە :

١. عثمان أحمد کوردی .

٢. إدریس محمود کوردی .

بە وەرگێڕانی کتێب و نوسراوەکانم بۆ زمانی کوردی و چاپکردنی .

لە ژێر چاودێری شێخ خلیل أحمد کەلاری .

وە داوا لە هەموویان دەکەم :

وردکاربن لە وەرگێڕان و دەقەکان ڕێك بخەن و ئەوپەڕی هەوڵبدەن و خۆماندوو بکەن .

درود و سڵاو لە پێغەمبەرمان محمد و ئەهل و هاوەڵانی .

نوسینی

ربیع بن هادی عمیر المدخلی

واژوو

٢٥/ ٩/ ١٤٣٢هـ

## ئەمەش فۆتۆکۆپی مۆڵەتپێدانی نووسەرە بە وەرگێڕانی کتێبەکانی

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على أشرف الأنبياء والمرسلين نبينا محمد وعلى آله وصحبه وسلم أما بعد:

فقد أذنت لكل من :

١- عثمان بن أحمد الكردي .

٢- إدريس بن محمود الكردي.

بترجمة كتبي ومقالاتي باللغة الكردية وطباعتها.

ويكون المشرف عليهما الشيخ خليل بن أحمد الكلاري.

واطلب منهم جميعا :

**الدقة في الترجمة وضبط النصوص وبذل غاية الوسع والاجتهاد في ذلك.**

وصلى الله على نبينا محمد وعلى آله وصحبه وسلم .

كتبه

ربيع بن هادي عمير المدخلي

٢٥/٩
١٤٣٢هـ

## پێشەکی وەرگێڕ

إِنَّ الحَمْدَ للهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِيْنُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ وَنَعُوْذُ بِاللهِ مِن شُرُوْرِ أَنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا ، مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ وَمَنْ يُضْلِلْ فَلا هَادِيَ لَهُ .

وَأَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلاّ اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيْكَ لَهُ ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُوْلُهُ. ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴿١٠٢﴾﴾ [آل عمران] ، ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ﴿١﴾﴾ [النساء] ،

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ﴿٧٠﴾ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾﴾ [الأحزاب] .

أَمَّا بَعْدُ :

فَإِنَّ أَصْدَقَ الحَدِيْثِ كِتَابُ اللهِ وَخَيْرَ الهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّدٍ (ﷺ) وَشَرَّ الأُمُوْرِ مُحْدَثَاتُهَا وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ .

**هەر گەل و نەتەوە و ئوممەتێك ڕێز لە ڕابردوو و مێژوو و پێشەوایانی خۆی نەگرێت ، شكست خواردوو و دواكەوتووە و تاكەكانی تووشی شكستە خۆی بوون ، چجای ئەو ئوممەتە ئوممەتی ئیسلامی خاوەن دوا پەیام و دوا پێغەمبەری پەروەردگاربێت ، وە پێشەوایانی هاوەڵانی محمد بێت ﷺ كە خودا و پێغەمبەرەكەی شاهیدی بەرزی و بەڕێزی و دادوەری و چاكەیان بۆ داون ، ئەم نوسراوەی شێخی بەڕێز ( د.ربیع المدخلی) وەڵامی كۆمەڵێك تانە و تەشەری سەیید قوتبە كە لە زۆربەی هاوەڵە بەڕێزەكان بەگشتی و كۆمەڵێك ئەستێرەی درەوشاوەی ئەو چاخە زێڕینانە بە تایبەتی داوە ، لەبەر ئەوە بەپێویستی دەزانم بەپێشەكییەكی كورت باسی هاوەڵە بەڕێزەكان بكەم بەگشتی و ئەوانەی ناوبراو تانە و تەشەری لێداون و ناماقوڵی بەرامبەركردوون بەتایبەتی ، بۆ ئەوەی خوێنەری بەڕێزی ئەم نوسراوە بزانێت كێن ئەو كەڵە پیاوانە و ڕێز و پلە و پایەیان چییە لە ئیسلامدا و دەبێت هەڵوێستی موسڵمانی سوننی چی بێت بەرامبەریان و دەبێت چۆن هەڵسوكەوت بكات لەگەڵ ئەو ناكۆكیانەی ڕویداوە لە نێوان هەندێكیان .**

## پێناسەی هاوەڵ

هاوەڵ (صحابی) هەموو ئەوانەن کە لەگەڵ پێغەمبەری خودادا(ﷺ) بوون و باوەڕیان پێهێناوە و لەسەر ئەو باوەڕە مردوون ، پێشەوا بوخاری (بەڕەحمەت بێت ) دەڵێت : ئەوەی هاوەڵیی پێغەمبەری(ﷺ) کردبێت یان بینی بێتی لە موسڵمانان ئەوە هاوەڵە .

زۆربەی زانایان دەڵێن : هەر کەسێك هاوەڵی پێغەمبەری(ﷺ) کردبێت باشترە لە هەرکەسێکی تر کە هاوەڵی نەکردبێت بە گشتی ، چونکە هاوەڵ بوون هیچ کردەوە و زانستێك ناتوانێت هاوتای بێت .

## بۆچی دەبێت باسی فەزڵ و ڕێزی هاوەڵان بکرێت وە ئایا بیروباوەڕی ئەهلی سوننەت و جەماعەت چی بە پێویست داناوە بۆیان؟

کاتێك بیدعەی خەوارج سەری هەڵدا و ( عەلی و موعاوییە و عەمری کوڕی العاص (رضي الله عنهم) ) یان کافر کرد ، وە هەروەها بیدعەی ڕەفز و ڕۆچوون لە عەلی و ئالوبەیتی (رضي الله عنهم) سەری هەڵدا ، و تانە و تەشەریان لە زۆربەی هاوەڵان دا ، چەند کەسێکی کەمیان نەبێت ، بەوەش کۆمەڵێك دروست بوون جنێو و تانە و تەشەریان لە هاوەڵان دەدا و ناماقوڵیان بەرامبەر دەکردن و کافریان دەکردن و گومانیان لەسەر ئایین و داد و فەزڵ و ڕێزیان دروست دەکرد ، لەبەر هەموو ئەو ناڕەوایانە زانایان و پێشەواکانی ئەهلی سوننەت زۆر بەتوندی بەرەنگاری بیدعەی خەوارج و ڕافیزە و ناسبییەکان کرد ، و بەدوو کاری گرنگ هەستان ، یەکەم : ڕوونکردنەوەی فەزڵ و پلە و پایەی هاوەڵان و بەرپەرچ دانەوەی هەموو ئەو بیدعەکارانەی کە ستەمیان لە هاوەڵان دەکرد بەکردار و گوفتار دووەم : ڕوونکردنەوەی ئەوەی کە لەسەر موسڵمانان چی پێویستە بەرامبەر بە هاوەڵان و دەبێت هەڵوێستی موسڵمان چی بێت لە ناکۆکی نێوان هەندێکیان .

## پلەوپایەی هاوەڵان لە نێو ئوممەتدا

هیچ پلە وپایەیەك دوای پێغەمبەرێتی بەرز و بەڕێزتر نییە لە پلەوپایەی ئەو کەسانەی کە خودا هەڵیبژاردوون بۆ هاوەڵی محمد(ﷺ) کە بەڕێزترین پێغەمبەر و دوا نێرراویەتی بۆ ئەوەی ئاینیان پێ سەربخات ، هاوەڵان باشترین هاوەڵانی پێغەمبەران و نێراوانی خودان بەگشتی ، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت : ((خير الناس قرني))[1] واتە: باشترین خەڵك خەڵکی سەردەمی منە.

وە بەگشتی دەتوانین ڕێز و پلە و پایەی هاوەڵان لەم خاڵانەی خوارەوە کورت بکەینەوە :

١. پێشەنگیان لە ئیسلامەتی .
٢. ئارامگرتنیان لە کاتی ناڕەحەتیدا .
٣. هاوەڵ و هاوڕابوونی پێغەمبەر(ﷺ) .
٤. کۆچکردن و پەنادانان .
٥. سەرخستنی ئیسلام و جیهاد و تێکۆشان .
٦. پێشەواییان لە زانست و کردەوە .
٧. گەیاندنی ئاین .

[1] رواه البخاري و مسلم و ابن ماجه و أحمد .

وە بەڵگە لەسەر پلەوپایە و ڕێزیان لە قورئان و سوننەتدا زۆر زۆرە لەوانە :

خودا دەفەرموێت : ﴿ مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلۡكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيۡنَهُمۡۖ تَرَىٰهُمۡ رُكَّعٗا سُجَّدٗا يَبۡتَغُونَ فَضۡلٗا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٗاۖ سِيمَاهُمۡ فِي وُجُوهِهِم مِّنۡ أَثَرِ ٱلسُّجُودِۚ ذَٰلِكَ مَثَلُهُمۡ فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِۚ وَمَثَلُهُمۡ فِي ٱلۡإِنجِيلِ كَزَرۡعٍ أَخۡرَجَ شَطۡـَٔهُۥ فَـَٔازَرَهُۥ فَٱسۡتَغۡلَظَ فَٱسۡتَوَىٰ عَلَىٰ سُوقِهِۦ يُعۡجِبُ ٱلزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ ٱلۡكُفَّارَۗ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِنۡهُم مَّغۡفِرَةٗ وَأَجۡرًا عَظِيمَۢا ٢٩ ﴾ [الفتح]

واتە : محمد ﴿ﷺ﴾ پێغەمبەری خودایە و ئەوانەی کە لەگەڵیدان توندن لە دژی بێبڕواکان ، و بەسۆز و بەزەیین لە نێوان یەکتردا ، دەیانبینیت کڕنوش و سوژدەیان بردووە بەو کارەیان ڕەزامەندی پەروەردگاریان دەوێت لە دواڕۆژدا ، لە نێوچاوانیاندا ئاسەواری سوژدەی پەرستشی زۆریان دیارە ، ئەوە نمونەیان بوو لە تەورات ، وە نمونەیان لە ئینجیل وەك درەختێکە چرۆی دەرهێناوە و قەدەکەی بەهێز دەکەن و لەسەر ڕەگەکانی خۆیان ڕادەگرن و جوتیارەکانی سەرسام دەکات بە جوانی و باشی گوڵ و بەرهەمەکەی ، شێوەی هاوەڵان ئاوهایە بۆ ئەوەی بێبڕواکان توڕە و غەمبار بکات ، خودا بەڵێنی بەوانەیان داوە کە باوەڕیان هێناوە و کردەوەی باش دەکەن بە لێخۆش بوون و پاداشتی گەورە.

وە دەفەرموێت :﴿ وَٱلَّذِينَ تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ وَٱلۡإِيمَٰنَ مِن قَبۡلِهِمۡ يُحِبُّونَ مَنۡ هَاجَرَ إِلَيۡهِمۡ وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمۡ حَاجَةٗ مِّمَّآ أُوتُواْ وَيُؤۡثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ وَلَوۡ كَانَ بِهِمۡ خَصَاصَةٞۚ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفۡسِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ٩ ﴾ [الحشر]

واتە : ئەوانەی کە خەڵکی مەدینە بوون و باوەڕیان لەدڵدا جێگیر بوو بوو لە پێش کۆچەرییەکان ، و ئەوانەی کۆچیان دەکرد بۆ لایان خۆشیان دەویستن ، وە ئەو ماڵەی کە پێیان درا لە دەستکەوتەکانی بەنی نضیر هیچی لە دڵدا دروست نەکردن بەڵکو ئەوەشی کە خۆیان پێویستیان پێبووایە دەیانبەخشی ، ئەوەی خۆی لە چروکی دەروونی بپارێزێت ئائەوانە سەرفەراز و سەرکەوتوون .

وە دەفەرموێت :﴿ وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلۡأَوَّلُونَ مِنَ ٱلۡمُهَٰجِرِينَ وَٱلۡأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحۡسَٰنٖ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُ وَأَعَدَّ لَهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي تَحۡتَهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ١٠٠ ﴾ [التوبة]

واتە : ئەوانەی پێشەنگ بوون لە کۆچەرییەکان و پشتیوانەکان و ئەوانەی شوێنیان کەوتوون بەکردەوی باش خودایان لێ ڕازییە و ئەوانیش لە خودا ڕازین ، خودا چەندان باخی سەوز و چڕوپڕی بۆ ئامادە کردوون کە ئاو بە ژێریاندا دەڕوات و بە هەتاهەتایی تیایدا دەمێننەوە ، ئەوە بردنەوەی گەورەیە .

وە دەفەرموێت :﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلۡنَٰكُمۡ أُمَّةٗ وَسَطٗا لِّتَكُونُواْ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيۡكُمۡ شَهِيدٗاۗ ١٤٣ ﴾[البقرة] .

واتە : خودا ئێوەی کردۆتە ئوممەتێکی هەڵبژێرراو و دادوەر بۆ ئەوەی شاهیدبن بەسەر خەڵکەوە و وە پێغەمبەری خوداش ﴿ﷺ﴾ شاهیدە بەسەر ئێوە وە .

وە دەفەرموێت :﴿ لَّقَدۡ رَضِيَ ٱللَّهُ عَنِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ إِذۡ يُبَايِعُونَكَ تَحۡتَ ٱلشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمۡ فَأَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ عَلَيۡهِمۡ وَأَثَٰبَهُمۡ فَتۡحٗا قَرِيبٗا ١٨ ﴾ [الفتح] ، واتە : خودا ڕازی بوو لەو باوەڕدارانەی لە ژێردارەکە لە حودەیبییە بەیعەتیان پێدایت خودا زانی چی لە ناخیاندایە ، خودا ئارامی و هێوری بەسەر دا دابەزاندن ، وە دەفەرموێت : ﴿ لَّقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِيِّ وَٱلۡمُهَٰجِرِينَ وَٱلۡأَنصَارِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ ٱلۡعُسۡرَةِ مِنۢ بَعۡدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٖ مِّنۡهُمۡ ثُمَّ تَابَ عَلَيۡهِمۡۚ إِنَّهُۥ بِهِمۡ رَءُوفٞ رَّحِيمٞ ١١٧ ﴾ [التوبة:] واتە : خودا لە کەم و کورتیەکانی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ و کۆچبەرەکان و

پشتیوانەکان خۆشبوو ، ئەوانەی کە لە کاتی زۆر گەرم و ناڕەحەت لە شەڕی تەبوک لەگەڵیدا بوون ، لە کاتێدا کە خەریك بوو دڵی هەندێکیان بگۆڕێت و بەلای نەڕۆیشتن و مانەوە دا بشکێتەوە ، دواتر لێیان خۆشبوو ، چونکە بە ڕاستی خودا بە سۆز و بە زەییە بۆیان .

وە دەفەرموێت : ﴿ لَا يَسْتَوِي مِنكُم مَّنْ أَنفَقَ مِن قَبْلِ الْفَتْحِ وَقَاتَلَ ۚ أُولَٰئِكَ أَعْظَمُ دَرَجَةً مِّنَ الَّذِينَ أَنفَقُوا مِن بَعْدُ وَقَاتَلُوا ۚ وَكُلًّا وَعَدَ اللَّهُ الْحُسْنَىٰ ﴿١٠﴾ ﴾ [الحديد] واتە : وەك یەك نین ئەوانەی پێش فەتحی مەککە ماڵیان بەخشیوە و جەنگاون ، ئەوانە پلەیان لەو کەسانە بەرز و بڵندترە کە دوای فەتحی مەککە ماڵیان بەخشیوە و جەنگاون ، وە خودا بەڵێنی بە هەشتی بە هەمووان داوە بەڵام بەهەشت پلەدارە.

وە دەفەرموێت :﴿ وَالَّذِينَ آمَنُوا وَهَاجَرُوا وَجَاهَدُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالَّذِينَ آوَوا وَّنَصَرُوا أُولَٰئِكَ هُمُ الْمُؤْمِنُونَ حَقًّا ۚ لَّهُم مَّغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴿٧٤﴾ ﴾[ الأنفال]

واتە : ئەوانەی باوەڕیان هێنا و کۆچیانکرد و لە پێناوی خودا تێکۆشان لە ڕێگەی خودا ، وە ئەوانەی پەنایاندان و سەریان خستن هەموو ئەوانە باوەڕداری ڕاستەقینەن ، لێبووردن و ڕۆزی زۆر بۆ هەیە.

**وە لە فەرموودەی پێغەمبەری خودا﴿ﷺ﴾ فەرموودەیەکی زۆر هاتووە دەربارەی ڕێز و پلە و پایەی هاوەڵان لەوانە:**

عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ (رضي الله عنه)، عَنِ النَّبِيِّ﴿ﷺ﴾قَالَ: (( خَيْرُ النَّاسِ قَرْنِي، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ ثُمَّ يَجِيءُ أَقْوَامٌ تَسْبِقُ شَهَادَةُ أَحَدِهِمْ يَمِينَهُ ، وَيَمِينُهُ شَهَادَةَ ))[٢]، **واتە : باشترین خەڵك خەڵکی ئەم سەردەمەی منە ، وە ئەوانەی دوای ئەوان دین ، وە ئەوانەی دوای ئەوان دین ، دوای ئەوان خەڵکانێك دێن زۆر سوێند دەخۆن تا سوێند خواردن دەبێتە خویان ئیدی سوێند دەخۆن پێش ئەوەی داوای سوێندخواردنیان لێبکرێت و گەواهی دەدەن پێش ئەوەی داوای گەواهیدانیان لێبکرێت .**

عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ (رضي الله عنه)، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﴿ﷺ﴾: (( لاَ تَسُبُّوا أَصْحَابِي، فَلَوْ أَنَّ أَحَدَكُمْ أَنْفَقَ مِثْلَ أُحُدٍ ذَهَباً مَا بَلَغَ مُدَّ أَحَدِهِمْ وَ لاَ نَصِيفَه))[٣]. **واتە : جنێو و قسەی نابەجێ بە هاوەڵانم مەڵێن ، سوێند بەو کەسەی نەفسی منی بەدەستە ئەگەر کەسێك لە ئێوە هێندەی ئوحود زێڕ ببەخشێت ناگاتە مشتێك یان نیو مشتی ئەوان .**

عَنْ عَلِيٍّ (رضي الله عنه) قَالَ : (( بَعَثَنِي رَسُولُ اللَّهِ﴿ﷺ﴾ وَأَبَا مَرْثَدٍ الْغَنَوِيَّ وَالزُّبَيْرَ بْنَ الْعَوَّامِ وَكُلُّنَا فَارِسٌ قَالَ انْطَلِقُوا حَتَّى تَأْتُوا رَوْضَةَ خَاخٍ فَإِنَّ بِهَا امْرَأَةً مِنْ الْمُشْرِكِينَ مَعَهَا كِتَابٌ مِنْ حَاطِبِ بْنِ أَبِي بَلْتَعَةَ إِلَى الْمُشْرِكِينَ فَأَدْرَكْنَاهَا تَسِيرُ عَلَى بَعِيرٍ لَهَا حَيْثُ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﴿ﷺ﴾ فَقُلْنَا الْكِتَابُ فَقَالَتْ مَا مَعَنَا كِتَابٌ فَأَنَخْنَاهَا فَالْتَمَسْنَا فَلَمْ نَرَ كِتَابًا فَقُلْنَا مَا كَذَبَ رَسُولُ اللَّهِ ﴿ﷺ﴾ لَتُخْرِجِنَّ الْكِتَابَ أَوْ لَنُجَرِّدَنَّكِ فَلَمَّا رَأَتْ الْجِدَّ أَهْوَتْ إِلَى حُجْزَتِهَا وَهِيَ مُحْتَجِزَةٌ بِكِسَاءٍ فَأَخْرَجَتْهُ فَانْطَلَقْنَا بِهَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فَقَالَ عُمَرُ : يَا رَسُولَ اللَّهِ قَدْ خَانَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَالْمُؤْمِنِينَ فَدَعْنِي فَلِأَضْرِبَ عُنُقَهُ فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ) : مَا حَمَلَكَ عَلَى مَا صَنَعْتَ قَالَ حَاطِبٌ : وَاللَّهِ مَا بِي أَنْ لَا أَكُونَ مُؤْمِنًا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ (ﷺ) أَرَدْتُ أَنْ يَكُونَ لِي عِنْدَ الْقَوْمِ يَدٌ يَدْفَعُ اللَّهُ بِهَا عَنْ أَهْلِي وَمَالِي وَلَيْسَ أَحَدٌ مِنْ أَصْحَابِكَ إِلَّا لَهُ هُنَاكَ مِنْ عَشِيرَتِهِ مَنْ يَدْفَعُ اللَّهُ بِهِ عَنْ أَهْلِهِ وَمَالِهِ فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ) : صَدَقَ وَلَا تَقُولُوا لَهُ إِلَّا خَيْرًا ، فَقَالَ عُمَرُ : إِنَّهُ قَدْ خَانَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَالْمُؤْمِنِينَ فَدَعْنِي فَلِأَضْرِبَ عُنُقَهُ

---

[٢] متفق عليه .

[٣] رواه البخاري .

فَقَالَ : أَلَيْسَ مِنْ أَهْلِ بَدْرٍ فَقَالَ : لَعَلَّ اللَّهَ اطَّلَعَ إِلَى أَهْلِ بَدْرٍ فَقَالَ : اعْمَلُوا مَا شِئْتُمْ فَقَدْ وَجَبَتْ لَكُمْ الْجَنَّةُ أَوْ فَقَدْ غَفَرْتُ لَكُمْ فَدَمَعَتْ عَيْنَا عُمَرَ وَقَالَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ ))(٤).

**واتە : عەلی (ﷺ) دەڵێت : پێغەمبەری خودا ﴿ﷺ﴾ من و أبو مرثدی الغنوی و زبێری کوڕی العوامی نارد کە هەر هەموومان سوار چاك بووین ، فەرمووی : بڕۆن تا دەگەنە باخچەی خاخ ئافرەتێکی موشریکی لێ یە کە نوسراوێکی حاتبی کوڕی ابو بەلتەعەی پێیە بۆ موشریکەکان ، پێی گەیشتین لەسەر حوشترکەی دەڕۆشت لەو شوێنەی کە پێغەمبەری خودا ﴿ﷺ﴾ دەستنیشانی کرد ، پێمان گوت : نوسراوەکە ، وتی : نوسراوم پێ نییە ، حوشترەکەیمان یەخدا نوسراوەکەمان نەدوزیەوە ، وتمان پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ درۆناکات ، نوسراوەکە دەردەهێنیت یان جلوبەرگەکەت دادەکەنین ، کە دیتی بەڕاستمانە ، دەستی برد بۆ ناوقەدی کە پۆشرابوو بە پارچەیەك و دەریهێنا ، بردمان بۆلای پێغەمبەری خودا ﴿ﷺ﴾ ، عمر وتی : ئەی پێغەمبەر خودا خیانەتی لە خودا و پێغەمبەرەکەی و باوەڕداران کردووە ، ڕێگەم بدە بدەم لە ملی (واتە: ملی حاتب) ، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرمووی : چی وایلێ کردیت کە ئەو کارەکە بکەیت ، حاتب وتی : سوێند بە خودا لەوەم نەبووە باوەڕم بە خودا و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) نەبێت ، بەڵکو ویستم لای ئەوان پشتێکم هەبێت خودا بە هۆیەوە ماڵ و منداڵم بپارێزێت وە هیچ کەس نییە لە هاوەڵانت ئیلا عەشیرەتی هەیە ، کە خودا بە هۆیانەوە ماڵ و منداڵیان دەپارێزێت ، پێغەمبەری خودا ﴿ﷺ﴾ فەرمووی : ڕاست دەکات ، لە چاکە زیاتر هیچی پێ مەڵێن ، عمر وتی : ئەی پێغەمبەر خودا خیانەتی لە خودا و پێغەمبەرەکەی و باوەڕداران کردووە ، ڕێگەم بدە بدەم لە ملی ، فەرمووی ئایە یەکێك نەبووە لەبەشداربووانی جەنگی بەدر ، وە فەرمووی : خودا بەو کەسانەی بەشداری جەنگی بەدریان کردووە فەرمووە : هەرچییەك بکەن خودا بەهەشتی بۆ پێویست کردوون ، یان لێتان خۆش بووم ، چاوەکانی عمر بە فرمێسك بوون و وتی خودا و پێغەمبەرەکەی زاناترن .**

عن جابر أن عبدا لحاطب جاء رسول الله يشكو حاطبا فقال : (( يا رسول الله ﴿ﷺ﴾ ليدخلن حاطب النار فقال رسول الله ﴿ﷺ﴾ :كذبت لا يدخلها فإنه شهد بدرا و الحديبية ))(٥) ، **واتە : بەندەیەکی حاتب هات بۆلای پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ وتی : ئەی پێغەمبەری خودا حاتب دەچێتە ئاگرەوە ، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرمووی : درۆتکرد ناچێتە ئاگرەوە لەبەر ئەوەی بەشداری بەدر و حودەیبییەی کردووە .**

عَنْ جَابِرًا قَالَ كُنَّا يَوْمَ الْحُدَيْبِيَةِ أَلْفًا وَأَرْبَعَ مِائَةٍ فَقَالَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﴿ﷺ﴾ : ((أَنْتُمْ الْيَوْمَ خَيْرُ أَهْلِ الْأَرْضِ ))(٦)، **واتە : ئێمە ڕۆژی حودەیبییە هەزار و چوار سەد کەس بووین پێغەمبەری خودا﴿ﷺ﴾ فەرمووی : ئێوە ئەمڕۆ باشترین خەڵکی سەر زەوین .**

عَنْ عَبْد الله بْنِ مَسْعُود أَنّ رَسُولَ اللّه ﴿ﷺ﴾ قَالَ : (( مَا مِنْ نَبيَ بَعَثَهُ الله في أُمّة قَبْلي، إلاّ كَانَ لَهُ مِنْ أُمّته حَوَارِيّونَ وَأَصْحَابٌ يَأْخُذُونَ بسُنّته وَيَقْتَدُونَ بأَمْرِه. ثُمّ إنّهَا تَخْلُفُ منْ بَعْدهم خُلُوفٌ، يَقُولُونَ مَا لاَ يَفْعَلُونَ، وَيَفْعَلُونَ مَا لاَ يُؤْمَرُونَ. فَمَنْ جَاهَدَهُمْ بيَده فَهُوَ مُؤْمنٌ، وَمَنْ جَاهَدَهُمْ بلِسَانه فَهُوَ مُؤْمنٌ، وَمَنْ جَاهَدَهُمْ بقَلْبه فَهُوَ مُؤْمنٌ. وَلَيْسَ وَرَاءَ ذَلكَ منَ

---

(٤) رواه مسلم .

(٥) رواه مسلم و الترمذي .

(٦) روا البخاري و مسلم .

الإِيمَانِ حَبَّةُ خَرْدَلٍ ))[٧]، واتە : هیچ پێغەمبەرێك نەبووە كە خودا ناردبێتی بۆ ئوممەتێكی پێش من ، لە ئوممەتەكەی كۆمەڵێك بوونەتە سەرخەر و هاوەڵی و سوننەت و فەرمانەكانی ئەویان جێبەجێ دەكرد ، لە دوای ئەوانە كەسانێك دین ئەوەی دەیڵێن كردەوەی پێناكەن ، و ئەو كردەوانە ئەنجام دەدەن كە فەرمانیان پێنەكراوە ، ئەوەی دژیان تێبكۆشێت ئەوە باوەڕدارە ، وە ئەوەی بە زمان لەدژیان تێبكۆشێت ئەوە باوەڕدارە ، وە ئەوەی بەدڵ رقی لێیان بێت و خۆشی نەوێن ئەوە باوەڕدارە ، لە دوای ئەوە باوەڕدار نییە بە ئەندازەی تۆوی دەنكە خەرتەلەیەك .

عَنْ سَعِيد بْنِ أَبِى بُرْدَةَ عَنْ أَبِى بُرْدَةَ عَنْ أَبِيهِ قَالَ صَلَّيْنَا الْمَغْرِبَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﴿صلى الله عليه وسلم﴾ ثُمَّ قُلْنَا لَوْ جَلَسْنَا حَتَّى نُصَلِّىَ مَعَهُ الْعِشَاءَ قَالَ: فَجَلَسْنَا فَخَرَجَ عَلَيْنَا فَقَالَ : (( مَا زِلْتُمْ هَا هُنَا ، قُلْنَا : يَا رَسُولَ اللَّهِ صَلَّيْنَا مَعَكَ الْمَغْرِبَ ثُمَّ قُلْنَا نَجْلِسُ حَتَّى نُصَلِّىَ مَعَكَ الْعِشَاءَ قَالَ : أَحْسَنْتُمْ أَوْ أَصَبْتُمْ ، قَالَ : فَرَفَعَ رَأْسَهُ إِلَى السَّمَاءِ وَكَانَ كَثِيرًا مِمَّا يَرْفَعُ رَأْسَهُ إِلَى السَّمَاءِ فَقَالَ : النُّجُومُ أَمَنَةٌ لِلسَّمَاءِ فَإِذَا ذَهَبَتِ النُّجُومُ أَتَى السَّمَاءَ مَا تُوعَدُ وَأَنَا أَمَنَةٌ لأَصْحَابِى فَإِذَا ذَهَبْتُ أَتَى أَصْحَابِى مَا يُوعَدُونَ وَأَصْحَابِى أَمَنَةٌ لأُمَّتِى فَإِذَا ذَهَبَ أَصْحَابِى أَتَى أُمَّتِى مَا يُوعَدُونَ ))[٨] ، واتە : نوێژی مەغریبمان كرد لەگەڵ پێغەمبەری خودا ﴿صلى الله عليه وسلم﴾ ، دواتر وتمان با دانیشین هەتا نوێژی عیشایشی لەگەڵدا بكەین ، دەڵێت : دانیشتین ، هات بۆ لامان و فەرمووی : هێشتا لێرەن ، ئەی پێغەمبەری خودا ﴿صلى الله عليه وسلم﴾ نوێژی مەغریبمان لەگەڵ كردیت ، وتمان دادەنیشین هەتا نوێژی عیشاشی لەگەڵدا دەكەین ، فەرمووی : باشتانكرد یان باشتان پێكا ، دەڵێت : سەری بەرزكردەوە بۆ ئاسمان ، وە زۆر جار سەری بۆ ئاسمان بەرز دەكردەوە و فەرمووی : ئەستێرەكان پارێزەری ئاسمانن ، ئەگەر ئەستێرەكان لە ناوچوون ئاسمان ئەوەی بۆی بڕیاردراوە بەسەری دێت لە تێكچوون و شەقبوون و ڕامالین ، وە من پارێزەی هاوەڵانمم ئەگەر من ڕۆیشتم ئەوەی كە بەڵێندراوە بە هاوەڵانم بەسەریان دێت لە ئاشوب و فیتنە و شەڕوپێكدادان و هەڵگەڕانەوەی هەندێك لە عەرەبەكان ، وە هاوەڵانم پارێزەرن بۆ ئوممەتەكەم ئەگەر هاوەڵانم ڕۆیشتن ئەوەی بەڵێندراوە بە ئوممەكەتم بەسەریاندا دێت لە سەرهەڵدانی بیدعە و فیتنە و ئاشوب لە ئایندا .

عن واثلة ابن الأسقع قال: قال رسول الله ﴿صلى الله عليه وسلم﴾ : (( لا تزالون بخيرٍ ما دامَ فيكُم من رآني وصاحَبَني ، والله لا تزالون بخيرٍ ما دام فيكُم من رأى من رآني وصاحبَ من صاحَبَني ، والله لا تزالون بخيرٍ ما دام فيكُم من رأى من رأى من رآني و صاحب من صاحَبَ من صاحَبَني ))[٩] ، واتە : بەردەوام لە خێردان تا ئەوكاتەی ئەو كەسانەتان لە نێودایە كە منی بینیووە و هاوەڵی كردووم ، وە سوێند بە خودا بەردەوام لە خێردان تا ئەوكاتەی ئەو كەسانەتان لە نێودایە كە ئەوانەیان بینیوە كە منی بینیوە و هاوەڵی كردووم ، سوێند بە خودا بەردەوام لە خێردان تا ئەوكاتەی ئەو كەسانەتان لە نێودایە كە تابعیەكانی بینیوە .

---

[٧] رواه مسلم .

[٨] رواه مسلم .

[٩] رواه ابن ابي شيبة في ( المصنف ) ، و الطبراني في ( المعجم الكبير ) ، و صححه الالباني في الصحيحة (٣٢٨٣) .

## بیروباوەڕی ئەهلی سوننەت و جەماعەت بەرامبەر هاوەڵانی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾

**پێشەوا الطحاوی (بەڕەحمەت بێت) دەڵێت :** ( وَنُحبُّ أَصْحَابَ رَسُولِ الله ، وَلاَ نُفرطُ فِي حُبِّ أَحَدٍ منْهُم؛ وَلاَ نَتَبَرَّأُ مِنْ أَحَدٍ منْهُم ، وَنُبْغضُ مَنْ يُبْغضُهُم، وَبِغَيْرِ الخَيْرِ يَذْكُرُهُم ، ولا نَذْكُرُهُم إلاَّ بخَيْرٍ ، وَحُبُّهُم دينٌ وإيمَانٌ وإحْسَانٌ ، وَبُغْضُهُم كُفْرٌ ونفَاقٌ وطُغْيَانٌ )[١٠] **واتە : هاوەڵانی پێغەمبەری خودامان ﴿ﷺ﴾ خۆشدەوێت ، وە لە خۆشویستنی هیچ یەکێکیان دا ڕۆناچین ، وە لە هیچ کەسیان خۆمان بێبەری ناکەین ، وە ڕقمان لەو کەسەی کە ڕقی لێیانە ، و بە خراپ باسیان دەکات ، وە بەخێر نەبێت باسیان ناکەین ، خۆشویستنیان لە ئاین و باوەڕ و چاکەیە ، وە ڕق لێبوونیان کوفر و دووڕووی و لە ڕێگە دەرچوونە.**

**وە پێشەوا شێخی ئیسلام ابن تیمیە (بەڕەحمەت بێت) دەڵێت :** ( وَمِنْ أُصُولِ أَهْلِ السُّنَّةِ وَالْجَمَاعَةِ سَلاَمَةُ قُلُوبِهِمْ وَأَلْسِنَتِهِمْ لأَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ صلى الله عليه وسلم ، كَمَا وَصَفَهُمُ اللهُ بِهِ فِي قَوْلِهِ تَعَالَى :﴿ وَٱلَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعۡدِهِمۡ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لَنَا وَلِإِخۡوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلۡإِيمَٰنِ وَلَا تَجۡعَلۡ فِي قُلُوبِنَا غِلّٗا لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ رَبَّنَآ إِنَّكَ رَءُوفٞ رَّحِيمٌ ﴿١٠﴾ ﴾ [الحشر] ، وَطَاعَةَ النَّبِيِّ صلى الله عليه وسلم فِي قَوْلِهِ: (( لاَ تَسُبُّوا أَصْحَابِي فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهُ لَوْ أَنَّ أَحَدَكُمْ أَنْفَقَ مِثْلَ أُحُدٍ ذَهَبًا مَا بَلَغَ مُدَّ أَحَدِهِمْ وَلا نَصِيفَهُ)) وَيَقْبَلُونَ مَا جَاءَ بِهِ الْكِتَابُ وَالسُّنَّةُ وَالإجْمَاعُ مِنْ فَضَائِلِهِمْ وَمَرَاتِبِهِمْ.

وَيُفَضِّلُونَ مَنْ أَنْفَقَ مِنْ قَبْلِ الْفَتْحِ ـــــ وَهُوَ صُلْحُ الْحُدَيْبِيَةِ ـــــ وَقَاتَلَ عَلَى مَنْ أَنْفَقَ مِنْ بَعْدُ وَقَاتَلَ. وَيُقَدِّمُونَ الْمُهَاجِرِينَ عَلَى الأَنْصَارِ، وَيُؤْمِنُونَ بِأَنَّ اللهَ قَالَ لأَهْلِ بَدْرٍ ـــــ وَكَانُوا ثَلاثَ مِائَةٍ وَبِضْعَةَ عَشَرَ ـــــ : (( اعْمَلُوا مَا شِئْتُم فَقَدْ غَفَرْتُ لَكُمْ )) ، وَبِأَنَّهُ لاَ يَدْخُلُ النَّارَ أَحَدٌ بَايَعَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ ؛ كَمَا أَخْبَرَ بِهِ النَّبِيُّ ﴿ﷺ﴾، بَلْ لَقَدْ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ، وَكَانُوا أَكْثَرَ مِنْ أَلْفٍ وَأَرْبَعِ مِائَةٍ ، وَيَشْهَدُونَ بِالْجَنَّةِ لِمَنْ شَهِدَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﴿ﷺ﴾ ، كَالْعَشَرَةِ، وَثَابِتِ بْنِ قَيْسِ بنِ شَمَّاسٍ، وَغَيْرِهِم مِّنَ الصَّحَابَةِ.

وَيُقِرُّونَ بِمَا تَوَاتَرَ بِهِ النَّقْلُ عَنْ أَمِيرِ الْمُؤْمِنِينَ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ (رضي الله عنه) وَغَيْرِهِ مِنْ أَنَّ خَيْرَ هَذِهِ الأُمَّةِ بَعْدَ نَبِيِّهَا : أَبُو بَكْرٍ، ثُمَّ عُمَرُ. وَيُثَلِّثُونَ بِعُثْمَانَ، وَيُرَبِّعُونَ بِعَلِيٍّ (رضي الله عنهم) ؛ كَمَا دَلَّتْ عَلَيْهِ الآثَارُ، وَكَمَا أَجْمَعَ الصَّحَابَةُ عَلَى تَقْدِيمِ عُثْمَانَ فِي الْبَيْعَةِ ، مَعَ أَنَّ بَعْضَ أَهْلِ السُّنَّةِ كَانُوا قَد اخْتَلَفُوا فِي عُثْمَانَ وَعَلِيٍّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا ـــــ بَعْدَ اتِّفَاقِهِمْ عَلَى تَقْدِيمِ أَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ ـــــ أَيُّهُمَا أَفْضَلُ ؟ فَقَدَّمَ قَوْمٌ عُثْمَانَ: وَسَكَتُوا، أَوْ رَبَّعُوا بِعَلِيٍّ، وَقَدَّمَ قَوْمٌ عَلِيًّا ، وَقَوْمٌ تَوَقَّفُوا ، لَكِنِ اسْتَقَرَّ أَمْرُ أَهْلِ السُّنَّةِ عَلَى تَقْدِيمِ عُثْمَانَ ثُمَّ عَلِيٍّ ، وَإِنْ كَانَتْ هَذِهِ الْمَسْأَلَةُ ـــــ مَسْأَلَةُ عُثْمَانَ وَعَلِيٍّ ـــــ لَيْسَتْ مِنَ الأُصُولِ الَّتِي يُضَلَّلُ الْمُخَالِفُ فِيهَا عِنْدَ جُمْهُورِ أَهْلِ السُّنَّةِ ، لَكِنِ الَّتِي يُضَلَّلُ فِيهَا: مَسْأَلَةُ الْخِلاَفَةِ ، وَذَلِكَ أَنَّهُمْ يُؤْمِنُونَ أَنَّ الْخَلِيفَةَ بَعْدَ رَسُولِ اللهِ ﴿ﷺ﴾ : أَبُو بَكْرٍ، وَعُمَرُ، ثُمَّ عُثْمَانُ، ثُمَّ عَلِيٌّ ، وَمَنْ طَعَنَ فِي خِلاَفَةِ أَحَدٍ مِنْ هَؤُلاءِ؛ فَهُوَ أَضَلُّ مِنْ حِمَارِ أَهْلِهِ.

وَيَتَبَرَّؤُونَ مِنْ طَرِيقَةِ الرَّوَافِضِ الَّذِينَ يُبْغِضُونَ الصَّحَابَةَ وَيَسُبُّونَهُمْ ، وَطَرِيقَةِ النَّوَاصِبِ الَّذِينَ يُؤْذُونَ أَهْلَ الْبَيْتِ بِقَوْلٍ أَوْ عَمَلٍ ، وَيُمْسِكُونَ عَمَّا شَجَرَ بَيْنَ الصَّحَابَةِ ، وَيَقُولُونَ : إِنَّ هَذِهِ الآثَارَ الْمَرْوِيَّةَ فِي مَسَاوِيهِمْ مِنْهَا مَا هُوَ كَذِبٌ ، وَمِنْهَا مَا قَدْ زِيدَ فِيهِ وَنُقِصَ وَغُيِّرَ عَنْ وَجْهِهِ، وَالصَّحِيحُ مِنْهُ هُمْ فِيهِ مَعْذُورُونَ: إِمَّا مُجْتَهِدُونَ مُصِيبُونَ، وَإِمَّا مُجْتَهِدُونَ مُخْطِئُونَ وَهُم مَّعَ ذَلِكَ لاَ يَعْتَقِدُونَ أَنَّ كُلَّ وَاحِدٍ مِنَ الصَّحَابَةِ مَعْصُومٌ عَنْ كَبَائِرِ الإِثْمِ وَصَغَائِرِهِ ؛ بَلْ يَجُوزُ عَلَيْهِمُ الذُّنُوبُ فِي الْجُمْلَةِ ، وَلَهُم مِّنَ السَّوَابِقِ وَالْفَضَائِلِ مَا يُوجِبُ مَغْفِرَةَ مَا يَصْدُرُ مِنْهُمْ ـــــ إِنْ صَدَرَ ـــــ ، حَتَّى إِنَّهُمْ يُغْفَرُ لَهُم مِّنَ السَّيِّئَاتِ مَا لاَ يُغْفَرُ لِمَنْ بَعْدَهُمْ ؛ لأَنَّ لَهُم مِّنَ الْحَسَنَاتِ الَّتِي تَمْحُو السَّيِّئَاتِ مَا لَيْسَ لِمَنْ بَعْدَهُمْ ، وَقَدْ ثَبَتَ بِقَوْلِ رَسُولِ اللهِ ﴿ﷺ﴾

---

[١٠] العقيدة الطحاوية (٣٥٦) .

أَنَّهُمْ خَيْرُ الْقُرُونِ ، وَأَنَّ الْمُدَّ مِنْ أَحَدِهِمْ إِذَا تَصَدَّقَ بِهِ كَانَ أَفْضَلَ مِنْ جَبَلِ أُحُدٍ ذَهَبًا مِمَّن بَعْدَهُمْ ، ثُمَّ إِذَا كَانَ قَدْ صَدَرَ مِنْ أَحَدِهِمْ ذَنْبٌ ؛ فَيَكُونُ قَدْ تَابَ مِنْهُ ، أَوْ أَتَى بِحَسَنَاتٍ تَمْحُوهُ ، أَو غُفِرَ لَهُ ؛ بِفَضْلِ سَابِقَتِهِ ، أَوْ بِشَفَاعَةِ مُحَمَّدٍ ﷺ الَّذِي هُمْ أَحَقُّ النَّاسِ بِشَفَاعَتِهِ ، أَوْ ابْتُلِيَ بِبَلاَءٍ فِي الدُّنْيَا كُفِّرَ بِهِ عَنْهُ. فَإِذَا كَانَ هَذَا فِي الذُّنُوبِ الْمُحَقَّقَةِ ؛ فَكَيْفَ الأُمُورُ الَّتِي كَانُوا فِيهَا مُجْتَهِدِينَ : إِنْ أَصَابُوا ؛ فَلَهُمْ أَجْرَانِ ، وَإِنْ أَخْطَؤُوا ؛ فَلَهُمْ أَجْرٌ وَاحِدٌ )[١١]

**واتە : ( لە بنچینەکانی ئەهلی سوننەت و جەماعەتە پاراستنی دڵ و زمانیان لە ئاست هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ، وەك چۆن خودا وەسفی کردوون : ئەوانەی دوای هاوەڵان هاتوون دەڵێن : پەروەردگارمان لە ئێمە خۆشبە وە لەو برایانەمان کە لە پێش ئێمەوە باوەڕدار بوون ، وە لە نێو دڵماندا هیچ ڕق و کینەیەك بەرامبەر باوەڕداران دروست مەکە ، پەروەردگارمان تۆ بە سۆز و بەزەییت ، وە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : جنێو و قسەی نابەجێ بە هاوەڵانم مەڵێن ، سوێند بەو کەسەی نەفسی منی بەدەستە ئەگەر کەسێك لە ئێوە هێندەی ئوحود زێڕ ببەخشێت ناگاتە مشتێك یان نیو مشتی ئەوان ، وە ئەوەی کە قورئان و سوننەت و کۆڕا لە فەزڵ و پلە و پایەیان هاتبێت بۆ یان دەسەلمێنین و پەسەندنی دەکەن .**

**وە فەزڵی ئەوانەی پێش ڕزگارکردنی مەککە ماڵیان بەخشیووە و تێکۆشاون ، کە پەیماننامەی حودەیبیەیە ، دەدەن بەسەر ئەوانەی دوای ئەوە ماڵیان بەخشیوە و تێکۆشاون ، وە کۆچەرییەکان دەدەن بەسەر پشتیوانەکاندا ، وە باوەڕیان وایە کە خودا بە بەدرییەکانی فەرمووە :** (اعْمَلُوا مَا شِئْتُم فَقَدْ غَفَرْتُ لَكُمْ) **، کە ژمارەیان سێسەد و یازدە تا نۆزدەکەس بوون ، وە هەروەها هەرکەسێك لە ژێردارەکە لە حودەیبیە بەیعەتی دابێت ناچێتە ئاگرەوە وەك چۆن پێغەمبەر ﷺ هەواڵی لەو بارەوە داوە ، بەڵکو خودایان لێرازی بوو وە ئەوانیش لە خودا ڕازی بوون ، کە لە هەزار و چوار سەد کەس زیاتر بوون ، وە دان بەبەهەشتدا دەنێن بۆ هەرکەسێك کە پێغەمبەر ﷺ گەواهی بەهەشتی بۆ دابێت ، وەك دەکەسە مژدە پێدراوەکە و ثابتی کوڕی قیسی کوڕی شماس ، و هاوەڵانی تر .**

**وە دان بەوەدا دەنێن کە بەموتەواتری لە علی کوڕی ابوطالب و هاوەڵی ترەوە هاتوو کە دەڵێن : باشترین کەسی ئەم ئوممەتە دوای پێغەمبەرەکەی ﷺ : أبو بەکرە ، و ئینجا عومەرە ، و سێیەم عثمانە ، و چوارەم علی یە ، کە بەڵگە لەسەر ئەوە هاتووە ، وە هەروەها هاوەڵان کۆڕابوون لەپێش خستنی عثمان لە بەیعەتدا ، ئەگەرچی هەندێك لە ئەهلی سوننەت ناکۆك بوون لە عثمان و علی دا کە کامیان باشترە ، دوای ئەوەی ڕێککەوتن لەسەر ابوبکر و عمر ، کەسانێك عثمانیان پێش خست ، و بێدەنگ بوون ، یان علییان بە چوارەمدا ، وە هەندێك علییان پێش خست ، وە هەندێك وەستان ، بەڵام ئەهلی سوننەت لەسەر ئەوە ڕاوەستان کە عثمان پێش علی یە ، ئەگەرچی ئەم پرسە ، پرسی علی و عثمان ، لە بنچینەکان نییە کە پێچەوانەکانی پێ گومڕا بکرێت لای زۆربەی ئەهلی سوننەت ، بەڵام ئەوەی دەبێتە مایەی گومڕابوون ، پرسی خەلافەتە ، بەوەی کە باوەڕیان وایە کە خەلیفە دوای پێغەمبەری خودا ﷺ ابوبکر ، و عمر ، و عثمان ، و علی یە ، ئەگەر کەسێك تانە لە خەلافەتی یەکێك لەوان بدات ، ئەوە لە کەرەکەی نەفامترە .**

**دواتر دەڵێت : خۆ بەدور دەگرین لە ڕێگەی ڕەوافزەکان کە ڕقیان لە هاوەڵانە و جنێویان پێدەدەن و ناماقوڵیان بەرامبەر دەکەن ، وە ڕێگەی نەواسبەکان کە ئازاری ئەهلوبەیت دەدەن بە وتە و بەکردار ، وە زمانیان**

---

[١١] العقيدة الواسطية .

دەپارێزن لەوەی کە لەنێوان هاوەڵان ڕوویداوە ، و دەڵێن : ئەو ڕیوایەتانەی لە بارەی خراپەیان گێڕڕاوەتەوە هەیانە هەڵبەستراو و درۆیە ، وە هەیانە کەم و زیادکراوە و لەمەبەستەکەی هەڵەکراوە ، ئەوەی ڕاستە ئەوان تیایدا عوزیان هەیە بەوەی کە ئیجتهادیان کردووە و پێکاویانە ، وەیان ئیجتهادیان کردووە و نەیانپێکاوە ، ئەوە لە کاتێکدا باوەڕیان وایە کە هاوەڵان پارێزراون نین لە هەڵە و تاوانە گەورەکان و بچوکەکان ، بەڵکو بەگشتی دەشێت هەڵە یان تاوان بکەن ، بەڵام هێندە پێشینەی باشیان هەیە پاساوی ئەوەیان بۆ دەکات کە خودا لێیان خۆشبێت ، هەتا بە شێوەیەك لە تاوانەکانیان دەبووڕێت ، کە بەو شێوەیە لە تاوانی ئەوانەی دوای ئەوان نابورێت ، چونکە هێندە چاکەیان هەیە کە هەڵە و تاوانەکانیان بسڕێتەوە ، دوای ئەوان ئەو چاکانەیان نییە ، وە بە فەرموودەی پێغەمبەری خودا ﴿ﷺ﴾ ئەوە سەلماوە کە ئەوان باشترین نەوەن ، وە مشتێك کە یەکێك لە هاوەڵان بیبەخشێت باشترە لە هێندەی کێوی ئوحود زێڕ ئەوانەی دوای ئەوان بیبەخشن ، دواتر ئەگەر کەسێکیان گوناهێکی کردبێت لەوانەیە تەوبەی لێکردبێت ، یان چاکەیەکی کردبێت سڕیویەتیەوە ، بە هۆی پێشەنگی لە ئیسلام ، یان بە شەفاعەتی پێغەمبەر (ﷺ) کە ئەوان شایانترین کەسن بە شەفاعەتی ، یان لە دونیا تووشی ناڕەحەتیەك بووە بە هۆیەوە لە تاوانەکەیان خودا خۆشبووە ، ئەمە ئەگەر لە تاوانە ڕاستەقینە ئەنجامدراوەکاندا وابێت ، چۆن دەبێت وانەبێت لەو کار و کردەوانەی کە ئیجتهادیان تێدا کردووە ، کە ئەگەر پێکابێتیان یەك پاداشت و نەیان پێکابێت دوو پاداشتیان بۆ هەیە .

## فەزڵی هەریەکە لە ئیمامی عثمان و معاویە و عەمری کوڕی العاص

عثمان ئەو کەسەیەکە زاوای پێغەمبەری خودایە ، و مێردی هەردوو کچەکەیەتی (رقیە و ام کلثوم) ، وە نەزانراوە کەسێکی تر هەبێت ئەو ڕێز و فەزڵەی دەستکەوتبێت بە درێژایی مێژوو .

عثمان یەکێکە لەو دە کەسەی مژدەی بەهەشتی پێدراوە .

عثمان یەکێك بووە لەو کەسانەی قورئانی زۆر بەباشی لەبەر بوو و فەرموودەکی زۆری زانیوە ، وە زۆر ڕەوشت بەرز بووە و کردەوەی زۆری کردووە .

عثمان ئەو کەسەیە کە پارە و سامانی زۆری بەخشیوە لە ڕێگەی خودا ، وە هیچ کەس لە سەردەمی هاوەڵاندا هێندەی عثمان پارە و سامانی لە ڕێگەی خودا نە بەخشیوە .

عثمان ئەو کەسەیە کە دوو جار کۆچی کردووە ، کۆچێك بۆ حەبەشە و کۆچێك بۆ مەدینە .

عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيُّ قَالَ : (( كُنْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﴿ﷺ﴾ فِي حَدِيقَةِ بَنِي فُلانٍ ، وَالْبَابُ عَلَيْنَا مُغْلَقٌ وَمَعَ النَّبِيِّ ﴿ﷺ﴾ عُودٌ يَنْكُتُ وَجَعَلَ النَّبِيُّ ﴿ﷺ﴾ يَنْكُتُ بِذَلِكَ الْعُودِ فِي الأَرْضِ إِذِ اسْتُفْتِحَ الْبَابُ ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﴿ﷺ﴾: يَا عَبْدَ اللَّهِ ابن قَيْسُ ، قُمْ فَافْتَحْ لَهُ الْبَابَ ، وَبَشِّرْهُ بِالْجَنَّةِ عَلَى بَلْوَى تَكُونُ ، فَقُمْتُ فَفَتَحْتُ لَهُ الْبَابَ ، وَإِذَا بِعُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ ، فَأَخْبَرْتُهُ بِمَا قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ) فَقَالَ : الْمُسْتَعَانُ اللَّهُ ، أَوْ عَلَى اللَّهِ التُّكْلانُ ، ثُمَّ دَخَلَ فَسَلَّمَ وَقَعَدَ ))[١٢]

واتە : لەگەڵ پێغەمبەری خودادا ﴿ﷺ﴾ بووم لە باخچەی کوڕەکانی فلان ، و دەرگاکەمان لەسەر داخرا بوو ، و پێغەمبەری خودا﴿ﷺ﴾ دارێك بە دەستیەوە بوو لە زەوی دەدا لەو کاتەدا یەکێك لە دەرگاکەی دا ، فەرمووی : ئەی عبداللەی کوڕی قەیس هەستە دەرگاکەی بۆ بکەوە و مژدەی بەهەشتی بدەرێ لەسەر کێشە و ئاشوبێك کە تووشی دەبێت ، هەستام دەرگاکەم بۆ کردەوە دیتم عثمانی کوڕی عففانە ، ئەوەم پێڕاگەیاند کە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرمووی ، وتی : پشت پێبەستراو تەنها خودایە ، یان پشت بە خودا دەبەسترێت ، ئیدی هاتە ژوورەوە و سەلامی کرد و دانیشت .

عَنْ ابْنِ عُمَرَ قَالَ : ((كُنَّا نَعُدُّ وَرَسُولُ اللَّهِ ﴿ﷺ﴾ حَيٌّ وَأَصْحَابُهُ مُتَوَافِرُونَ أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ وَعُثْمَانُ ثُمَّ نَسْكُتُ)) ، واتە : ئێمە دەمان ژمارد لە کاتێکدا پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ زیندوو بوو و هاوەڵانیش بوونیان هەبوو ابوبکر و عمر و عثمان ، ئیدی بێدەنگ دەبووین .

عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضی الله عنهما قَالَ : (( كُنَّا فِى زَمَنِ النَّبِىِّ لاَ نَعْدِلُ بِأَبِى بَكْرٍ أَحَداً ثُمَّ عُمَرَ ثُمَّ عُثْمَانَ ثُمَّ نَتْرُكُ أَصْحَابَ النَّبِىِّ لاَ نُفَاضِلُ بَيْنَهُمْ ))[١٣] ، واتە : ئێمە لەسەردەمی پێغەمبەردا﴿ﷺ﴾هیچ کەسمان بە ابوبکر یەکسان نەکردوو و لە ئاستی ئەومان نەدەزانی ، دوای ئەو عمر ، دوای ئەو عثمان دوای ئەوان لە نێو هاوەڵانی پێغەمبەردا ﴿ﷺ﴾ کەسمان بەسەر کەسدا نەدەدا .

---

[١٢] رواه البخاري و مسلم .

[١٣] رواه البخاري .

عَنْ قَتَادَةَ ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ أَنَّ النَّبِيَّ ﴿ﷺ﴾ وَأَبَا بَكْرٍ ، وَعُمَرَ ، وَعُثْمَانَ صَعَدُوا أُحُدًا ، فَرَجَفَ بِهِمْ ، فَضَرَبَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﴿ﷺ﴾ بِرِجْلِهِ ، وَقَالَ : ((اثْبُتْ أُحُدُ فَإِنَّمَا عَلَيْكَ نَبِيٌّ وَصِدِّيقٌ وَشَهِيدَانِ ))[١٤] ، **واتە : پێغەمبەری خودا﴿ﷺ﴾ و ابوبكر و عمر و عثمان سەر ئوحد كەوتن ، لەرزاندیانی ، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ بە پێی لێیدا و فەرمووی : ئوحد خۆڕاگرە چونكە پێغەمبەرێك و ڕاستگۆیەك و دوو شەهیدت لەسەرە .**

عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ : (( كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﴿ﷺ﴾ مُضْطَجِعًا فِي بَيْتِهِ كَاشِفًا عَنْ فَخِذَيْهِ أَوْ سَاقَيْهِ ، فَاسْتَأْذَنَ أَبُو بَكْرٍ فَأَذِنَ لَهُ ، فَدَخَلَ وَهُوَ عَلَى تِلْكَ الْحَالِ فَتَحَدَّثَ ، ثُمَّ اسْتَأْذَنَ عُمَرَ ، فَأَذِنَ لَهُ وَهُوَ كَذَلِكَ فَتَحَدَّثَ ، ثُمَّ اسْتَأْذَنَ عُثْمَانَ ، فَجَلَسَ رَسُولُ اللَّهِ ﴿ﷺ﴾ وَسَوَّى ثِيَابَهُ ، فَدَخَلَ فَتَحَدَّثَ ، فَلَمَّا خَرَجَ ، قَالَتْ عَائِشَةُ : يَا رَسُولَ اللَّهِ ، دَخَلَ أَبُو بَكْرٍ فَلَمْ تَهْتَشَّ لَهُ وَلَمْ تُبَالِهِ ، ثُمَّ دَخَلَ عُمَرُ ، فَلَمْ تَهْتَشَّ لَهُ وَلَمْ تُبَالِهِ ، ثُمَّ دَخَلَ عُثْمَانُ ، فَجَلَسْتَ وَسَوَّيْتَ ثِيَابَكَ ؟ فَقَالَ : أَلا أَسْتَحِي مِنْ رَجُلٍ تَسْتَحِي مِنْهُ الْمَلائِكَةُ ))[١٥] .

**واتە : پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ لە ماڵەكەیدا ڕاكشابوو ڕانەكانی یان لاقەكانی بەدەرەوە بوون ، ابوبكر ڕوخسەتی خواست ، ڕوخسەتی پێدرا لەسەر ئەو حاڵەتە بوو قسەی كرد ، دواتر عمر ڕوخسەتی خواست ڕوخسەتی پێدرا هەر لەسەر ئەو حاڵەتە بوو قسەی كرد ، دواتر عثمان ڕوخسەتی خواست پێغەمبەری خودا جلوبەرگەكەی ڕێخست و دانیشت ، هاتە ژوورەوە و قسەی كرد ، كاتێك دەرچوو عائشە وتی : ئەی پێغەمبەری خودا ﴿ﷺ﴾ ابوبكر هاتە ژوورەوە و نەجوڵایت و گرنگ نەبوو بەلاتەوە ، دواتر عمر هاتە ژوورەوە و نەجوڵایت و گرنگ نەبوو بەلاتەوە ، دواتر كە عثمان هاتە ژورەوە دانیشتیت و جلوبەرگەكەت ڕێكخست ؟ فەرمووی : ئایا شەرم نەكەم لە كەسێك كە فریشتە شەرمی لێ دەكات .**

عن ابن عمر قال : ذكر رسول الله ﴿ﷺ﴾ فتنة فمر رجل فقال : (( يُقتل فيها هذا المقنَّع يومئذ مظلوماً )) قال: فنظرت فإذا هو عثمان بن عفان (رضي الله عنه)[١٦] .

**پێغەمبەری خودا ﴿ﷺ﴾ باسی فیتنە و ئاشوبی كرد ، پیاوێك تێپەڕی فەرمووی : ئەم دەمامەكدارە لەو ڕۆژەدا بە ستەم لێكراوی دەكوژرێت ، دەڵێت : دیقەتم دا دیتم عثمانی كوڕی عەففانە.**

---

[١٤] رواه البخاري و أبو داود و الترمذي .

[١٥] رواه مسلم .

[١٦] رواه احمد ، و الترمذی وحسنه و وافق ابن كثير الترمذي في تحسينه ، و وافقهم الالباني في ( الصحيحة ) تحت رقم (٣١١٨) .

## وتەی هاوەڵان لەسەر فەزڵ و ڕێزی عثمان

(عن محمد بن حاطب قال كنت مع علي بالبصرة فلما هدأت الحرب قلت يا أمير المؤمنين ما أرد على قومي إذا سألوني عن قتل هذا الرجل قال أنا وعثمان مثل ما وصف الله في كتابه ﴿وَنَزَعْنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنْ غِلٍّ ﴿٤٣﴾﴾ [الأعراف] فإذا قدمت فأبلغهم أن عثمان من الذين آمنوا ثم اتقوا ثم آمنوا ثم اتقوا ثم آمنوا ثم اتقوا وعلى ربهم يتوكلون)[١٧] ، **واته : محمدی کوڕی حاطب دەڵێت : لەگەڵ علی دا بووم لە بەسرە دوای ئەوەی جەنگ هێوەر بوویەوە وتم : ئەی فەرمانڕەوای باوەڕداران چی بڵێم بە کەسوکارم ئەگەر پرسیارم لێبکەن دەربارەی کوشتنی ئەم پیاوە وتی : من و عثمان نمونەمان وەك ئەوە وایە کە لە قورئاندا دەفەرمویت :** ﴿وَنَزَعْنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنْ غِلٍّ ﴿٤٣﴾﴾ [الأعراف] **واتە : هەرچی ڕق و کینە هەیە لە دڵیاندا دەرمان هێناوە ، ئەگەر گەڕایتەوە بۆ لایان پێیان بڵێ : کە عثمان لەوانەیە کە باوەڕیان هێنا و لە خودا ترسان ، دواتر باوەڕیان هێنا و لە خودا ترسان ، دواتر باوەڕیان هێنا و لە خودا ترسان و پشتیان بە پەروەردگاریان بەست .**

(عن رافع بن خديج قال : قال علي : دخلت على بناتي وهن يبكين فقلت ما يبكيكن قلن لانقطاعنا من أرضنا ولموت أو لقتل ابن عفان فقال : إني لأرجو أن أكون أنا وابن عفان ممن قال الله : ﴿وَنَزَعْنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنْ غِلٍّ إِخْوَانًا عَلَىٰ سُرُرٍ مُّتَقَابِلِينَ ﴿٤٧﴾﴾ [الحجر])[١٨] ، **واته علی دەڵێت : چووم بۆلای کچەکانم دەگریان ، وتم چی دەتان گریەنێت ، وتیان : لەبەر ئەوەی لە وڵاتی خۆمان دورکەوتوینەتەوە ، وە بۆ مردنی یان کوشتنی عثمانی کوڕی عەففان ، وتی : هیوادارم من کوڕی عەففان لەو کەسانەبین کە خودا پێیان دەفەرموێت :** ﴿وَنَزَعْنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنْ غِلٍّ إِخْوَانًا عَلَىٰ سُرُرٍ مُّتَقَابِلِينَ ﴿٤٧﴾﴾ [الحجر] ، **واتە : هەرچی ڕق و کینە هەیە لە دڵیاندا دەرمان هێناوە ، برایانە لەسەر ڕاخراو ڕووبەڕوو .**

(عن ابن عباس قال لما أن قتل عثمان بن عفان رأيت رسول الله ﴿ﷺ﴾ في منامي فمر بي فسلم علي فقلت حبيبي رسول الله ألا تقف حتى أشتفي منك بالنظر قال إني مستعجل إن أبي إبراهيم وأخي موسى منتظرون لي لزفاف عثمان بن عفان الليلة )[١٩] ، **ابن عباس دەڵێت : کاتێك عثمانی کوڕی عەففان کوژرا پێغەمبەری خودام﴿ﷺ﴾ لە خەودا بینی دای بەلامداو سەلامی لێکردم وتم : خۆشەویستم پێغەمبەری خودا ﴿ﷺ﴾ بریا بوەستی بۆ ئەوەی تێرچاوم سەیرت بکەم ، فەرمووی : بەپەلەم چونکە ابراهیمی باوکم و موسای برام چاوەڕوانم دەکەن بۆزەماوەندی عثمانی کوڕی عەففان ئەم شەو .**

( عن زهدم الجرمي قال: خطب بن عباس فقال لو لم يطلب الناس بدم عثمان لرموا بالحجارة من السماء )[٢٠] . **واته : ابن عباس وتاری خوێند وتی : ئەگەر خەڵك داوای خوێنی عثمان نەکەن لە ئاسمانەوە بەرد باران دەکرێن .**

(عن أبي حازم قال: كنت عند عبد الله بن عمر بن الخطاب فذكر عثمان، فذكر فضله ومناقبه وقرابته حتى تركه أنقى من الزجاجة)[٢١]، **واته : لای عبداللەی کوڕی عمرم بووم باسی عثمانی کرد ، باسی فەزڵ و پلەوپایە و خزمایەتی کرد تا وای لێکرد لە شووشە پاکتری کرد .**

(عن ابن عمر –رضي الله عنهما-: لا تسبوا عثمان؛ فإنا كنا نعده من خيارنا)[٢٢] ، **واته : قسەی نابەجێ و نەشیاو بە عثمان مەڵێن ، چونکە ئێمە لە باشترینەکانمان (واتە لە هاوەڵان) دەژمارد .**

---

[١٧] ((مختصر تاريخ دمشق))لإبن عساكر (١٦/٢٥٦).

[١٨] ((البداية و النهاية)) لإبن كثير (٧/ ١٩٣) ، ((مختصر تاريخ دمشق))لإبن عساكر (١٦/٢٥٦).

[١٩] ((مختصر تاريخ دمشق))لإبن عساكر (١٦/٢٦٠).

[٢٠] ((البداية و النهاية)) لإبن كثير (٧/ ١٩٣) ، ((مختصر تاريخ دمشق))لإبن عساكر (١٦/٢٦٠).

[٢١] ((مختصر تاريخ دمشق))لإبن عساكر (١٦/٥٠٦).

# فەزڵ و ڕێزی عەمر کوڕی العاص

عن أبي هريرة عن النبي ﴿ﷺ﴾ قال : (( ابنا العاص مؤمنان : هشام و عمرو))[٢٣] ، **واتە : هەردوو کوڕەکەی العاص باوەڕداران : هشام و عەمر .**

عن عقبة بن عامر يقول : سمعت رسول الله ﴿ﷺ﴾ يقول : (( أسلم الناس و آمن عمرو بن العاص ))[٢٤] ، **واتە : خەڵك موسڵمان بوون و عەمری کوڕی العاص باوەڕی هێنا .**

عن طلحة بن عبيد الله قال : سمعت رسول الله ﴿ﷺ﴾ يقول : (( عمرو بن العاص من صالحي قريش ))[٢٥] ، **واتە : عەمری کوڕی عاص لە پیاو چاکانی قورەیشە .**

علقمة بن رمثة البلوي أنه قال : (( بعث رسول الله ﴿ﷺ﴾ عمرو بن العاص إلى البحرين ، ثم خرج رسول الله ﴿ﷺ﴾ في سرية ، وخرجنا معه ، فنعس رسول الله ﴿ﷺ﴾ ثم استيقظ ، فقال : رحم الله عمرا ، قال : فتذاكرنا كل إنسان اسمه عمرو ، قال : ثم نعس ثانية ، فاستيقظ ، فقال : رحم الله عمرا ، ثم نعس الثالثة ، فاستيقظ ، فقال : رحم الله عمرا ، فقلنا : من عمرو يا رسول الله ؟ قال : عمرو بن العاص ، قالوا : ما باله ؟ قال : ذكرته أني كنت إذا ندبت الناس إلى الصدقة ، جاء من الصدقة فأكثر ، فأقول : من أين لك هذا يا عمرو ؟ فيقول : من عند الله ، وصدق عمرو ، إن لعمرو عند الله خيرا كثيرا ))[٢٦] ، **واتە : پێغەمبەری خودا﴿ﷺ﴾عەمری کوڕی العاصی نارد بۆ بەحرێن ، دواتر پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ لەگەڵ کۆمەڵێك سەربازدا دەرچوو و ئێمەش لەگەڵیدا دەرچووین ، کەمێك خەوی لێکەوت کاتێك هەستا فەرمووی : خودا بەزەی بە عەمردا بێتەوە ، دەڵێت : هەموو عەمر ناوێکمان بە بیرهێنایەوە ، دواتر بۆ جاری دووەم خەوی لێکەوت و کاتێك هەستا فەرمووی : خودا بەزەی بە عەمردا بێتەوە ، دواتر بۆ جاری سێیەم خەوی لێکەوت و کاتێك هەستا فەرمووی : خودا بەزەی بە عەمردا بێتەوە ، وتمان عەمرکێیە ئەی پێغەمبەری خودا ﴿ﷺ﴾؟ ، فەرمووی : عەمری کوڕی العاص ، وتیان : چییەتی ، فەرمووی :بیرم کەوتەوە من کاتێك خەڵك ڕادەسپێرم بۆماڵی خێر ، عەمر خێری دەهێنا خێرێکی زۆر ، دەڵێم : ئەم خێرەت لە کوێ بوو ئەی عەمر ؟ دەڵێت : لە خوداوەیە ، عەمر ڕاستی کرد ، بەڕاستی بۆ عەمر لای خودا پاداشتی زۆر هەیە .**

عن عمرو بن العاص قال : أرسل إلي رسول الله ﴿ﷺ﴾ : (( أن اجمع عليك سلاحك وثيابك ثم ائتني ، قال : فأتيته وهو يتوضأ فقال : يا عمرو إني أرسلت إليك لأبعثك في وجه يسلمك الله ويغنمك وأزعب لك زعبة من المال ، فقلت : يا رسول الله ما كانت هجرتي للمال وما كانت إلا لله ولرسوله قال : نعما بالمال الصالح للرجل الصالح ))[٢٧] ، **واتە : پێغەمبەری خودا ﴿ﷺ﴾ ناردی بەشوێنمدا ، کە جلوبەرگ و چەك و تفاقت کۆ بکەرەوە و وەرە بۆلام ، دەڵێت : هاتم بۆلای دەست نوێژی دەگرت ، فەرمووی : ئەی عەمر ناردم بە شوێنتدا بۆ ئەوەی بتنێرم بۆ شوێنێك خودا بتپارێزێت و ماڵ و پارەت دەست بخات و بڕێك پارەت بدەمێ ، وتم : ئەی پێغەمبەری خودا ﴿ﷺ﴾ من کۆچم نەکردووە لەبەر پارە و ماڵ ، بەڵکو تەنها لەبەر خودا و پێغەمبەرەکەی کۆچم کردووە ، فەرمووی : چەند باشە کە پارە و ماڵی باش بۆ کەسی باش بێت .**

---

[٢٢] فضائل الصحابة لإلأمام أحمد بن حنبل (١/١٧٢).

[٢٣] رواه احمد و الحاكم و صححه الالباني في (الصحيحة) برقم ( ١٥٦ ) .

[٢٤] رواه أحمد ( ٤ / ١٥٥ ) ، و الترمذي ( ٢ / ٣١٦ ) ، و حسنه الالباني في (الصحيحة) (١٥٥) .

(٢٥) رواه أحمد و الترمذي و صححه الالباني في (الصحيحة) برقم ( ٦٥٣ ) .

(٢٦) رواه احمد و الحاكم في (المستدرك) و صححه و وافقه الذهبي و الطبراني في (المعجم الكبير) .

(٢٧) رواه أحمد و الحاكم في (المستدرك) وأبو يعلى و البغوي والقضاعي و ابن عساكر و صححه الالباني في (غاية المرام) .

# فەزڵ و ڕێزی موعاویەی کوڕی أبوسفیان

عن عبد الرحمن بن أبي عميرة المزني عن النبي ﴿ﷺ﴾ قال : (( اللهم اجعله هاديا مهديا و اهده و اهد به ، يعني معاوية ))[٢٨] ، **واتە : خودا هیدایەتی بدە و هیدایەتی خەڵکیش بدە بە هۆیەوە ، مەبەستی موعاوییە بوو .**

وَعَن الْعِرْبَاض : (( سَمِعْتُ رَسُولَ الله ﴿ﷺ﴾ وَهُوَ يَدْعُو إِلَى السَّحُورِ فِي شَهْرِ رَمَضَانَ ، فَقَالَ : هَلُمُّوا إِلَى الْغَدَاءِ الْمُبَارَكِ قَالَ : ثُمَّ سَمِعْتُهُ يَقُولُ : اللهمَّ عَلِّمْ مُعَاوِيَةَ الْكِتَابَ وَالْحِسَابَ وَقِهِ الْعَذَابَ ))[٢٩] ، **واتە : گوێم لە پێغەمبەری خودا﴿ﷺ﴾ بوو کە بانگی دەکرد بۆ پارشێو لە مانگی ڕەمەزاندا ، فەرمووی : بابچین بۆ ژەمی موبارەك ، دەڵێت : دواتر گوێم لێبوو فەرمووی : خودا موعاویە فێری قورئان و ژماردن و بکە و لە سزا بیپارێزە .**

((عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ كُنْتُ أَلْعَبُ مَعَ الصِّبْيَانِ فَجَاءَ رَسُولُ اللَّه ﴿ﷺ﴾ فَتَوَارَيْتُ خَلْفَ بَاب قَالَ فَجَاءَ فَحَطَأَنِي حَطْأَةً وَقَالَ اذْهَبْ وَادْعُ لِي مُعَاوِيَةَ قَالَ فَجِئْتُ فَقُلْتُ هُوَ يَأْكُلُ قَالَ ثُمَّ قَالَ لِيَ اذْهَبْ فَادْعُ لِي مُعَاوِيَةَ قَالَ فَجِئْتُ فَقُلْتُ هُوَ يَأْكُلُ فَقَالَ لَا أَشْبَعَ اللَّهُ بَطْنَهُ .... قال : اذهب فادع لي معاوية وكان كاتبه قال فسعيت فقلت أجب نبي الله (ﷺ) فإنه على حاجة))[٣٠] . **واتە : ابن عباس دەڵێت : لەگەڵ منداڵاندا یاریم دەکرد پێغەمبەری خودا ﴿ﷺ﴾ هات ، خۆم لە پشت دەرگاکە حەشاردا دەڵێت : هات و لە پشتی دام و فەرمووی : بڕۆ موعاویەم بۆ بانگ بکە دەڵێت : ڕۆشتم و گەڕامەوە و وتم نان دەخوات ، دووبارە پێی فەرمووم : بڕۆ موعاویەم بۆ بانگ بکە دەڵێت : ڕۆشتم و گەڕامەوە و وتم نان دەخوات ، فەرمووی : خودا سکی تێری نەکات ... فەرمووی : بڕۆ موعاوییەم بۆ بانگ بکە ، موعاوییە نوسەری پێغەمبەری خودا بوو (ﷺ) ، دەڵێت : ڕۆیشتم ، وتم : وەڵامی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بدەرەوە ، ئیشی پێتە .**

**شیخ ئەلبانی بەڕەحمەت بێت لە (السلسلة الصحيحة) دا دەڵێت : هەندێك کۆمەڵ ئەم فەرموودەیە بەکار دەهێنن بۆ تانەدان لە موعاوییە ﴿رضي الله عنه﴾ ، بەڵام هیچی تێدا نییە کە یارمەتی دەریان بێت بۆ ئەو مەبەستە ، چۆن وایە کاتێك باسی ئەوە دەکات کە موعاوییە نووسەری قورئان و نیگای پەروەردگار بوو بۆ پێغەمبەر(ﷺ)؟! لەبەر ئەوە حافز ابن عساکر دەڵێت : ئەو فەرموودەیە ڕاسترین فەرموودەیە کەلە فەزڵی موعاوییەدا هاتووە ، وە ئەو نزایەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە قیامەتدا دەبێتە خێر و چاکە بۆ موعاوییە بە بەڵگەی ئەم فەرموودەیە کە پێغەمبەری خودا ﴿ﷺ﴾ فەرموویەتی :** (( اللَّهُمَّ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ فَأَيُّمَا رَجُلٍ مِنَ الْمُسْلِمِينَ سَبَبْتُهُ أَوْ لَعَنْتُهُ أَوْ جَلَدْتُهُ فَاجْعَلْهَا لَهُ زَكَاةً وَرَحْمَةً ))[٣١] **واتە : خودایە من مرۆڤم هەر موسڵمانێك قسەم پێوتبێت یان نەفرەتم لێکردبێت یان جەڵدەم لێدابێت بیکە بە زەکات و بەزەیی بۆی .**

**لەبەر ئەوە پێویستە هەموو موسڵمانێکی سوننی بەو شێوازە بڕوانێتە هاوەڵان و دان بەو هەموو فەزڵ ڕێزەدا بنێ کە بۆ ئەو شا پیاوانە سەلماوە ، بە هیچ شێوەك بیر لە تانە و تەشەری هاوەڵان نەکاتەوە و هەموو ئەو کەسانەی ڕق لێبێت کە ناماقوڵی بەرامبەر هاوەڵان دەکەن .**

عثمان أحمد

١٤ ى ذي الحجة ١٤٣٢ هـ

---

(٢٨) رواه البخاري في (التاريخ ) ، و الترمذي ، و ابن عساكر في ( تاريخ دمشق ) ، و صححه الالباني في (الصحيحة) برقم (١٩٦٩) .

(٢٩) رواه ابن خزيمة في (صحيحه ) ، و ابن حبان ، و أحمد ، و البزار ، والطبراني في ( المعجم الكبير) ، وابن عدي في (الكامل ) ، وابن عساكرفي (تاريخ دمشق) ، و صححه الالباني في (الصحيحة) برقم (٣٢٢٧) .

(٣٠) رواه أبو داود الطيالسي في " مسنده " ( ٢٧٤٦ ) و صححه الالباني في (الصحيحة) برقم (٨٢) .

(٣١) رواه مسلم .

# تێـــــڕوانینی سەید قطب
# بۆ
# هاوەڵانی پێغەمبەر ﴿صلى الله عليه وسلم﴾

نوسینی

شێخی پایەبەرز

ربيع بن هادي عمير المدخلي

بەناوی خودای بەخشندەی میهرەبان

## پێشەکی

سوپاس و ستایش بۆ خودا ، و درود و سڵاو لەسەر پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ ، و ئەهل و هاوەڵانی و ئەوانەی بە ئاشکرا و پەنهان خۆشیان دەوێن و داکۆکی لە هاوەڵانی محمد﴿ﷺ﴾ دەکەن و پارێزگاریان لێدەکەن بەمەبەستی ڕەزامەندی پەروەردگار .

دواتر :

لەبەر ئەوەی هاوەڵانی محمد﴿ﷺ﴾ پلە و پایەیەکی گەورە و بەرزیان هەیە کە خودای پەروەردگار بڕیاری داوە بۆیان لە کتێبەکانیدا کە ناردویەتیە خوارێ بۆ ئەوەی ڕێنمونی بێت بۆ مرۆڤایەتی ، وە لەسەر زاری پێغەمبەرانی کە ڕاسپێردراون بە گەیاندنی ئەو پەیامانەی کە ئەو ڕێنمونی و هیدایەتە لە خۆدەگرێت .

خودا دەفەرموێت : ﴿ مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلۡكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيۡنَهُمۡۖ تَرَىٰهُمۡ رُكَّعٗا سُجَّدٗا يَبۡتَغُونَ فَضۡلٗا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٗاۖ سِيمَاهُمۡ فِي وُجُوهِهِم مِّنۡ أَثَرِ ٱلسُّجُودِۚ ذَٰلِكَ مَثَلُهُمۡ فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِۚ وَمَثَلُهُمۡ فِي ٱلۡإِنجِيلِ كَزَرۡعٍ أَخۡرَجَ شَطۡـَٔهُۥ فَـَٔازَرَهُۥ فَٱسۡتَغۡلَظَ فَٱسۡتَوَىٰ عَلَىٰ سُوقِهِۦ يُعۡجِبُ ٱلزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ ٱلۡكُفَّارَۗ ﴿٢٩﴾ ﴾ [الفتح] واتە : محمد﴿ﷺ﴾ پێغەمبەری خودایە و ئەوانەی کە لەگەڵیدان توندن لە دژی بێبڕواکان ، و بەسۆز و بەزەیین لە نێوان یەکتردا ، دەیانبینیت کڕنوش و سوژدەیان بردووە بەو کارەیان ڕەزامەندی پەروەردگاریان دەوێت لە دواڕۆژدا ، لە نێوچاوانیاندا ئاسەواری سوژدەی پەرستشی زۆریان دیارە ، ئەوە نمونەیان بوو لە تەورات ، وە نمونەیان لە ئینجیل وەك درەختێکە چرۆی دەرهێناوە و قەدەکەی بەهێز دەکەن و لەسەر ڕەگەکانی خۆیان ڕادەگرن و جوتیارەکانی سەرسام دەکات بە جوانی و باشی گوڵ و بەرهەمەکەی ، شێوەی هاوەڵان ئاوهایە بۆ ئەوەی بێبڕواکان توڕە و غەمبار بکات ، وە لە ئاستیاندا دەفەرموێت :

﴿ لَا يَسۡتَوِي مِنكُم مَّنۡ أَنفَقَ مِن قَبۡلِ ٱلۡفَتۡحِ وَقَٰتَلَۚ أُوْلَٰٓئِكَ أَعۡظَمُ دَرَجَةٗ مِّنَ ٱلَّذِينَ أَنفَقُواْ مِنۢ بَعۡدُ وَقَٰتَلُواْۚ وَكُلّٗا وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلۡحُسۡنَىٰۚ ... ﴿١٠﴾ ﴾[الحديد]

واتە: وەك یەك نین ئەوانەی پێش فەتحی مەککە ماڵیان بەخشیوە و جەنگاون ، ئەوانە پلەیان لەو کەسانە بەرز و بڵندترە کە دوای فەتحی مەککە ماڵیان بەخشیوە و جەنگاون ، وە خودا بەڵێنی بە هەشتی بە هەمووان داوە بەڵام بەهەشت پلەدارە.

وە دەفەرموێت :﴿ كُنتُمۡ خَيۡرَ أُمَّةٍ أُخۡرِجَتۡ لِلنَّاسِ تَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَتَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَتُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِۗ ﴿١١٠﴾ ﴾[آل عمران] واتە : ئێوە باشترین ئوممەتن کە هێنراونەتە بوون بۆ خەڵك فەرمان بە چاکە دەکەن و یاساغی خراپە دەکەن و باوەڕ دەهێنن بە خودا ، پێشەوا ابن کثیر دەڵێت :ابن عباس دەفەرموێت : ئەو کەسانەن کە لە مەککەوە لەگەڵ پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ کۆچیان کرد بۆ مەدینە .

وە دەفەرموێت : ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلۡنَٰكُمۡ أُمَّةٗ وَسَطٗا لِّتَكُونُواْ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيۡكُمۡ شَهِيدٗاۗ ... ﴿١٤٣﴾ ﴾[ البقرة] واتە : خودا ئێوەی کردۆتە ئوممەتێکی هەڵبژێرراو و دادوەر بۆ ئەوەی شاهیدبن بەسەر خەڵکەوە و وە پێغەمبەری خوداش﴿ﷺ﴾ شاهیدە بەسەر ئێوە وە.

وە دەفەرموێت :﴿ وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلۡأَوَّلُونَ مِنَ ٱلۡمُهَٰجِرِينَ وَٱلۡأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحۡسَٰنٖ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُ وَأَعَدَّ لَهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي تَحۡتَهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴿١٠٠﴾ ﴾[التوبة] واتە : پێشەنگە یەکەمەکان لە

کۆچەرییەکان و پشتیوانان و ئەوانەی بە باشی شوێنیان کەوتوون خودا لێیان ڕازییە و ئەوانیش لە خودا ڕازی دەبن ، خودا چەندان باخی چڕوپڕی بۆ ساز و ئامادە کردوون کە ڕووباری ئاو بە ژێریاندا دەڕوات بە نەمری تیادا دەمێننەوە ، ئەوە سەرکەوتنی گەورەیە ، وە پێغەمبەری خودا ﴿ﷺ﴾ زۆر بە جوانی باسیان دەکات و ستایشیان دەکات ، و دەفەرموێت : ((خير الناس : قرني، ثم الذين يَلُونَهم، ثم الذين يَلُونَهم ...)) واتە : باشترین خەڵکی ئەم سەردەمەی منە ، وە ئەوانەی لە دوای ئەوانەوە دێن ، وە ئەوانەی لە دوای ئەوانەوە دێن .

وە دەفەرموێت : ((لا تسبُّوا أصحابي، فو الذي نفسي بيدِه لو أنفقَ أحدُكم مثلَ أُحُدٌ ذهبـًا ما بَلَغَ مُدَّ أحدِهم ولا نَصِيفَه))[٣٢] واتە : جنێو و قسەی نابەجێ بە هاوەڵانم مەڵێن سوێند بەو کەسەی نەفسی منی بەدەستە ئەگەر کەسێك لە ئێوە هێندەی ئوحود زێڕ ببەخشێت ناگاتە مشتێك یان نیو مشتی ئەوان .

پێشینە چاکەکانمان لەم ڕاستیە گەورە و پلەوپایە بەرزە بۆ ئەو بەڕێزە هەڵبژێردراوانە گەیشتبوون ، سەرکردە و چاوساغ و پێشەوا لە زانست و جیهاد و پەرستش و ڕەوشت و ڕاستگۆیی لە هەموو شتێك لە گوفتار و گەیاندنی ئاین ، و کارپێکردن ، و بانگەواز بۆ کردنی و جیهاد و تێکۆشان لە ڕێگەی بڵاوکردنەوە و سەرخستنی بەسەر هەموو ئاینەکانی تردا .

پێشینە چاکەکانمان لەم ڕاستی و پلەوپایە بەرزە بۆ ئەو بەڕێزانە گەیشتبوون ، وە ئەو تێگەیشتنە لە دڵیاندا جێگیر بوو بوو ؛ و بە ئاینیان دەزانی ، و ئوممەتیان لەسەر ئەوە پەروەردە کرد ، وە لەسەر پلەوپایە و ڕێزی هاوەڵان نوسراوی زۆریان نووسییەوە .

وە موسڵمانان ئەوەیان لێوەرگرتن نەوە دوای نەوە ، لەو بەرنامە و بۆچوونانەیان کەس پێچەوانەیان نەبوو کەسێك نەبێت کە خودا ڕیسوا و خراپی کردبێت ، کە بێباکە لەوەی کە قورئان و کتێبەکانی پێش ئەویش بۆیان بڕیار داون ، و هەروەها پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ و پیاو چاکانی ئوممەتەکەی .

وە لەبەر باوەڕمان بەم پلەوپایە بەرزە بۆ ئەو پێشەوا بەڕێزانەی ئوممەت ، بینیمان کە پێویستە لەسەرمان کە ئەو پلەوپایەیان وە بیربهێنینەوە و بەرگری لە مافەکانیان بکەین و بیانپارێزین ، و ببەخشین لە پێناویاندا  خوێنی دڵ و لاشەمان و ماڵمان و سامانمان و لەوەشدا لە لۆمەی هیچ لۆمەکارێك نەترسین .

وە وا دەبینین کە خۆشویستن و سەرخستنیان بنچینەیەکی گەورەیە لە بنچینەکانی ئاینی خودا ، وە ڕق لێبوون و تانەدان لە ئاین و دادپەروەریان کوفرە وەك زایانی ئیسلام ئەوەیان پشتڕاست کردۆتەوە ، چونکە تانەدان لە ئاین و دادپەروەریان تانەدانە لەوانەی ئاینیان پێگەیاندووین چ قورئان بێت یان سوننەت .

لەسەر ئەوانەی پارێزگاری لەو کەسانە دەکەن کە تانە لە هاوەڵان دەدەن پێویستە ئەم ڕاستیانە بزانن و حساب بۆ ئەم کارە گرنگە بکەن هەزار جار ، وە تێبفکرێت و تێڕابمێنێت و بزانێت کە پێ لە کوێی ئیسلامدا دادەنێت پێش ئەوەی ئالودە بێت بەوەی بەرگری لەوکەسانە بکات کە تانە لە هاوەڵی باشترین پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ دەدەن .

---

[٣٢] رواه البخاري و مسلم .

وە پێویستە ترسناکی و گرانی ئەو کارە هەست پێبکات ، و پاساو هێنانەوە و لێکدانەوەی هەڵە ڕەتبکاتەوە و پەسەند نەبێت لای وە لەسەر هەموو ئوممەتە تێکڕا بە تایبەت گەنجان ئەو شتە هەست پێبکەن .

لەم لاپەڕانەی کە دێت بە ئەمانەتەوە ئەو نوسراوانەی سەیید قوتب کە تۆماری کردووە لە (العدالة الاجتماعية في الإسلام) ، و (كتب و شخصيات) دا هێناومە ، لەو تانانەی کە ئەوەی بۆنی ئیسلامی کردبێت و لە دڵیدا شتێك لە ڕێز هەبێت بۆ ئەو هاوەڵە بەڕێزانە ناتوانێت قەبوڵی بکات .

لە کتێبی (العدالة) دا کە نوسەرەکەی بەردەوام ئامادە و چاپی دەکردەوە هەتا مرد ، وە خۆشەویستان و سەرخەرانی بەردەوام بڵاویان دەکردەوە بێباکانە و بێ گوێدانە هیچ شتێك تا ڕۆژگاری ئەمڕۆمان ، ئەو موسڵمانانە بەچییەوە سەرقاڵن و چۆن خۆیان بێئاگا دەکەن لە ئاست ئەو سوکایەتیەی کە بەهاوەڵانی محمد ﴿ﷺ﴾ کراوە لەو کاتەوەی پێش پەنجا ساڵ کە ئەو کتێبەی نوسیوەتەوە تا ڕۆژگاری ئەمڕۆ ، وە بەتایبەت گەنجانی موسڵمان بەچییەوە قاڵن .

چۆن لووت گرژ دەکرێت و ڕق دەبزوێت بۆ کەسێك سوکایەتی بە ڕێزی هاوەڵانی محمد ﴿ﷺ﴾ بکات ، بەڵام ئەو کەسانە لووت گرژ نابن و ڕقیان نابزوێت لەدژی ئەو کەسانە بۆ هاوەڵانی محمد﴿ﷺ﴾ ! ! ؟

موسڵمانینە ، زانایان ، زانستخوازان ، لە پیر و گەنج چۆن ئەم کارە نەشیاوە زۆر خراپە چەند دەیەیەك بەردەوام دەبێت ، لە نێوتاندا و بە برەوە بە بێدەنگی و بێ هەڵوەستە لەسەر کردن ، و ئەو کەسەشی پێی هەستاوە گەورە دەکرێت و ڕێز و ناوبانگی هەیە ! ! ؟؟.

خودایە من بە خۆشەویستی هاوەڵانی محمد﴿ﷺ﴾ و غیرەتی ئیسلام پەرستشی تۆدەکەم و بەو هۆیەوە داوای نزیك بوونەوەت لێدەکەم ، وە دیسان پەرستشی تۆدەکەم و داوای نزیك بوونەوەت لێدەکەم بە دورگرتن و خۆ جیاکردنەوە لەوانەی تانە لەو هاوەڵە بەڕێزانە دەدەن ، لە کەم و کورتیم خۆشبە لە بەجێنەهێنانی مافەکانت و مافی هاوەڵان ، وە موسڵمانان یارمەتی بدە بۆ بەجێهێنانی مافەکانت و مافی هاوەڵان ، بەڕاستی تۆ بیسەر و بینایت ، و توانای بەسەر هەموو شتێکدا .

## سەيید قوتب بێ ئەدەبی زۆر دەکات لە دژی عثمان:ـ هەندێکی پەیوەندی بە کەسایەتیەوە هەیە ، هەندێکی تانەدانە لە داد و حوکمی وەك بەخشینی ماڵ و کاربەدەستی بە خزمەکانی ، هەرهەموو ئەوانە ناڕەوا و ناڕاستن

سەيید قوتب لە کتێبی ( العدالة الاجتماعية ) (ل١٥٩) دا دەڵێت : ( ئەمە وێنای ڕاستی حوکمە کە شتێك گۆڕا بە بێگومان لەسەر دەمی عثماندا ـ ئەگەر چی لە چوارچێوەی ئیسلامدا مایەوە ـ عثمان کاتێك بوو بە خەلیفە لە تەمەندا پیر بوو بوو ، لە پشتیەوە مەروانی کوڕی حەکەم کاری بەڕێوە دەبرد بە زۆرێك لە لادان لە ئیسلام ، وەك چۆن کەسێتی و سروشتی عثمان کە خۆشگوزەران و حاڵخۆش بوو ، و خزم و کەسەکانی زۆر خۆش دەویست ، ئەو دوو خاڵە وایان لێکردبوو کە کۆمەڵە هەڵسوکەوتێك بکات کە زۆربەی هاوەڵانی دەوروبەری نکولی لێبکەن ، کە دواتر دەرهاوێشتە و پاشخانی خراپی هەبوو ، کە بووە مایەی سەر هەڵدانی فیتنە و ئاشوب کە ئیسلام زۆری بەدەستیانەوە چەشت .

عثمان لە (بيت المال) دوو سەد هەزار درهەمی بەخشیە حارثی کوڕی حەکەمی زاوای لە ڕۆژی زەماوەندەکەی ، کاتێك کە ڕۆژ بوویەوە زەیدی کوڕی ئەرقەم کە خەزنەداری (بيت المال) بوو هات بۆ لای عثمان و لە نێو چاوانیدا غەم و پەژارە دیار بوو وە فرمێسك پڕ چاوەکانی بوو ، داوای لێکرد لەو کارەی بیبەخشێت ، کاتێك بە هۆکارەکەی زانی کە بەخشینەکەی بوو بە زاواکەی لە پارەی موسڵمانان ، بەسەر سوڕمانێکەوە وتی : دەگریت ئەی کوڕی ئەرقەم لەبەر ئەوەی سیلەی ڕەحمم بەجێ گەیاندووە ؟ ئەو پیاوەی کە ڕۆحی ورد و ناسکی ئیسلامی هەست پێ دەکرد وەڵامی دایەوە و وتی : نەخێر ئەی کاربەدەستی باوەڕداران ، بەڵکو دەگریم لەبەر ئەوەی وا گومان دەبەم ئەم ماڵەت بردووە لە بری ئەوەی لە ڕێگەی خودا بەخشی بووت لە سەردەمی پێغەمبەر ، سوێند بە خودا ئەگەر سەد درهەمت بدایەتێ هێشتا زۆر بوو! ، عثمان توڕە بوو لەو پیاوەی کە وێژدانی ئەو پارە بەخشینەی لە ماڵی موسڵمانان قەبوڵ نەکرد بە خزمەکانی خەلیفەی موسڵمانان و پێی وت : کلیلەکان دابنێ ئەی کوڕی ئەرقەم کەسێکی تر بەو کارە ڕادەسپێرین !

نمونە زۆرە لەو دەست گوشادیانە لە ژیاننامەی عثماندا ، ڕۆژێك شەش سەد هەزاری بەخشیە زوبێر ، و دوو سەد هەزاری بەخشیە طلحە ، و پێنجیەکی خەراجی ئەفریقای دایە مەروانی کوڕی حەکەم ، لەبەر ئەوە خەڵکێك لە هاوەڵان سەرزەنشتیان کرد ، لەسەرووی هەموویانەوە علی کوڕی أبوطالب ، لە وەڵامیاندا وتی : من خزم و کەس و کارم هەیە ، نکولی ئەوەیان لێکردوو پرسیاریان لێکرد : ئایە ابوبکر و عمر کەس و کاریان نەبوو ، وتی : ابوبکر و عمر بەکاری باشیان دەزانیی و چاوەڕوانی پاداشتی خودا بوون لە دەستگرۆی نەکردن و یارمەتی نەدانی خزم و کەس و کاریان ، بەڵام من بە کاری باشی دەزانم و چاوەڕوانی پاداشتی خودام لە پێدان و یارمەتی خزم و کەس و کارم ، بە توڕەیی لای هەستان و دەیانگوت : سوێند بە خودا ئاکار و کردەوەی ئەوان خۆشەویسترە لە لامان لەوەی تۆ دەیکەیت .

جگە لە ماڵ و سامان بەرپرسیارێتیش ، عثمان دەستکراوە بوو لەبەخشینی بەرپرسیارێتی و کار بەدەستی بە خزمەکانی ، کە موعاویەیان تێدا بوو کە سنووری فەرمانڕەوایی فراوانکرد و فەلەستین و حمصی خستە ژێر

دەسەڵاتی ، وە سەرکردایەتی چوار سوپاکەی دایە دەستی بەوەش ڕێخۆشکاری بۆ کرد کە داوای پادشایی بکات لە خەلافەتی علی دا کە ماڵ و سوپاشی کۆکردبووە وە .

وە کاربەدەستانی عثمان (حەکەمی کوڕی عاص) یان تێدا بوو کە پێغەمبەر دووری خستبووە وە وەدەری نابوو ، عثمان داڵدەیدا و مەروانی کوڕی کردە وەزیری دەست ڕۆیشتوو و کاربەڕێوەبەری خۆی .

وە عبداللەی کوڕی سعدی کوڕی أبی السرح کە برای شیری عثمانە یەکێکی تر بوو لە کاربەدەستانی عثمان ...هتد) .

**دەڵێین : هیچێك لەو باسە ناڕەوا و ناڕاست و ستەمکاریانە ڕاست و جێگیر نییە .**

## شۆڕش لە دژی عثمان هەڵقوڵاوی ڕۆحی ئیسلامە

## مەروان یاری پێدەکات و عثمان بووەتە لێخوڕاوی مەروان چۆن بیەوێت لێی دەخوڕێت

دیسان دەڵێت لە ( ل ١٦٠ ـ ١٦١ ) : ( لە دوایدا شۆڕش لە دژی عثمان هەڵگیرسا ، و ڕەوا و ناڕەوا و خێر و شەڕ تێکەڵ بوون ، بەڵام خۆ دەبێت کەسێك هەبێت سەیری کارەکان بکات بە چاوی ئیسلام ، و هەست بەکارەکان بکات بە ڕۆحی ئیسلام ، و دان بەوەدابنێت کە ئەو شۆڕشە بەگشتی هەڵقوڵاوی ڕۆحی ئیسلام بوو ، ئەوە لە کاتێکدا بێ پشتگوێ خستنی ئەوەی کە فێڵی (ابن سبأ)ی جولەکە لە پشتیەوە بوو نەفرینی خودای لێبێت !

پۆزشمان بۆ عثمان هێنایەوە (خودای لێ ڕازی بێت) : بەوەی کە لە کۆتاییدا بوو بە خەلیفە و درەنگ وەخت ئەو کارەی بۆ هات ، ئومەویەکان لەدەور دەستی بوون کە تەمەنی نزیك دەبوویەوە لە هەشتا ساڵ ، ئیدی ئەو وابوو کە علی کوڕی أبو طالبی هاوەڵی وەسفی دەکات : ئەگەر من لەماڵەوە دابنیشم دەڵێت : پشتی تێکردم و مافی خزمایەتی بەجێ نەگەیاندم ، وە ئەگەر قسە بکەم ئەوە نابیسێت کە دەیەوێت ، مەروان یاری پێدەکات ، و بووەتە لێخوڕاوی مەروان چۆن بیەوێت لێی دەخوڕێت ، دوای بە ساڵاچوونی تەمەنی و هاوەڵێتی بۆ پێغەمبەری خودا ﴿ﷺ﴾) .

**ئەو شۆڕشگێڕانەی کە سەیید قوتب پیایاندا هەڵدەدات پێغەمبەری خودا ﴿ﷺ﴾پێیان دەفەرموێت : دووڕوون ئایە قسەی کێ وەربگرین ؟**

## تۆمەتبارکردنی عثمان بەوەی پەلەی کردووە و ئاینی بە پێنەگەیشتن داوەتە دەست پیاوە ئومەویەکان

دیسان دەڵێت (ل١٦١) : ( لە سەرئەنجامی ئەو پەلە کردنە ئاین بە ناکاملی و پێنەگەیشتویی دەستی پیاوانی ئومەوی بەسەردا زاڵبوو لەسەردەمی خەلیفەی سێیەم لە پیریدا ، نەریتە کرداریەکانی ئیسلام دانەمەزرا لەسەر بنەماکانی لە ڕوانگەی فەرمایشتە تیۆرییەکانی بۆ سەردەمێکی درێژ .

وە لەبەر ئەوەی سەردەمی خەلافەتی عثمان درێژبوو ئومەویەکان دەسەڵاتیان گەشەی کرد و گەورە و فراوان بوو لە شام و شوێنەکانی تر ، وە ماڵ و سامان زۆر زۆر بوو لە دەرئەنجامی سیاسەتی عثمان ـ وەك دواتر باسی دەکەین ـ ، وە درز کەوتنە نێو بونیاتی ئوممەتی ئیسلامی وە شۆڕش کردن لە دژی عثمان لە کاتێکی زۆر زووتر بوو .

لەگەڵ ئەوەی مێژووی ئەم سەردەمە و ڕووداوەکانی شانازی زۆری بۆ ئەم ئاینە تۆمار کردووە ، لە لایەکی ترەوە پەردە لەسەر دیدی خەڵك ڕادەماڵێت لە بۆچوونیان بۆ ژیان و حوکمڕانی ، و مافەکانی فەرمانڕەواکان و مافەکانی خەڵك ، بەڵام ئەو فیتنەیەی کە ڕوویدا پێویستە ترسناکی و ئاسەوارە درێژ ماوەکانی بچووك نەکرێتەوە) .

## عثمان وای بەجێهێشت دەوڵەتی ئومەوی بەکرداری  دروست بێت بەهۆی ئەوەی دەست ڕۆیشتووی کردبوون کە بنەماکانی ئومەوییەت کە پێچەوانەی ڕۆحی ئیسلام بوو سەقامگیربکەن

سەیید قوتب دەڵێت(ل١٦١) : ( عثمان کۆچی کرد و چوو بۆ لای بەزەیی پەروەردگاری ، بەڵام بەکرداری وای بەجێهێشت کە دەوڵەتی ئومەوی بوونی هەبێت بە هۆی ئەو سەقامگیرییە کە بۆی کردبوون لەسەر زەوی ، بە تایبەت لە شام ، وە بەهۆی ئەو ڕێگە پێدان و سەقامگیرییەی بنەماکانی دەوڵەتی ئومەویەوە کە پێچەوانەی ڕۆحی ئیسلامە ، لە دامەزراندنی پادشایەتی بۆماوەیی و تاکڕەوی و دەستگرتن بەسەر دەستکەوتەکانی جەنگ و پارە و بەرژەوەندییەکان ، کە بووە مایەی هەژاندن و درز تێکەوتنی ڕۆحی گشتی ئیسلام .

وە کەم نییە ئەوەی کە لە دڵی خەڵکدا ئەوە گەڵاڵە بێت ـ بە حەق بێت یان ناحەق ـ کە خەلیفە خزم و کەسەکانی خۆی بەسەر خەڵکدا دەدات و سەدان هەزاریان پێ دەبەخشێت ، و هاوەڵانی پێغەمبەری خودا کەنار دەخات و دوژمنانی پێغەمبەری خودا دەکات بەکار بەدەست ، کەسی هاوشێوەی أبو ذر دوور دەخاتەوە  لەبەر ئەوەی نکوڵی کۆکردنەوەی سەرمایەی دەکرد ، و نکوڵی ئەو خۆش گوزەرانی و تەخشان و پەخشانەی دەکرد کە دەوڵەمەندەکان تێدا گەوزابوون ، وە بانگەوازی دەکرد بۆ هاوشێوەی ئەوەی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ بانگەوازی بۆ دەکرد لە بەخشین و چاکەکاری و دونیا نەویستی .. لەبەر ئەوە ئەنجامی ئاسایی بڵاوبوونەوەی ئەو بۆچوونانە ، ئەگەر حەق بێت یان نا حەق ، ئەوەیە کە دەروونەکان هەڵبچن و هەندێکی تریان ساردببنەوە و تیابچن .

دەروونی ئەو کەسانەی کە ناخیان ڕۆحی ئاینی خواردبووە وە هەڵدەچێت بە نکوڵی کردن و تاوانبارکردن ، و تیادەچێت دەروونی ئەوانەی کە ئیسلامیان وەکو پۆشاکێك دابووە سەرشانیان ، و تێکەڵاوی دڵیان نەبوو بوو ، ئەوانەی کە ئارەزووەکانی دونیا ڕیشە کێشیان دەکات ، وە وا دەبینن کە دەبێت بچەمنەوە لەگەڵ شەپۆلەکاندا ، هەموو ئەوانە  لە کۆتاییەکانی سەردەمی عثماندا بوو ) .

**ڕۆچوونی لە علی و پشت ڕاست کردنەوەی چەند ڕیوایەتێکی درۆ و بێمانا ، وە بانگەشەی ئەوەی کە علی حوکم دەگەڕێنێتەوە سەر ئەو شێوازەی کە پێغەمبەر ﷺ دایڕشتبوو وە دوو خەلیفەکەی دوای ئەو لەسەری بوون ، واتە عثمان شێوازی حوکم کردنی تێکداوە یان چەواشەی کردووە**

سەیید قوتب دەڵێت(ل ١٦١ ـ ١٦٢) : ( علی ـ كرّم الله وجهه[٣٢] ـ بوو بە کاربەدەست ئەوکات ئاسان نەبوو کارەکە بۆ ڕێڕەوی خۆی بگێڕێتەوە ، و ئەوانەی سوودمەند بوون لە سەردەمی عثمان بەتایبەت ئومەوییەکان زانیان علی بێدەنگ نابێت لە ئاستیان ئیدی خۆیان و بەرژەوەندیەکانیان دایە پاڵ موعاویە ، علی هات بۆ ئەوەی دیدی ئیسلامی بۆ حوکم بگێڕێتەوە لەلای کاربەدەستان و خەڵکیش .

هات بۆ ئەوەی جۆ بخوات کە خێزانەکەی بە دەستی خۆی دەیهاڕی ، و کۆتایی ژیانی بە تورەکەیەك جۆ هێناو دەیگوت : حەزناکەم بچێتە سکمەوە ئەوە نەبێت کە دەیزانم ، وە لەوانەیە شمشێرەکەی فرۆشتبێت بۆ ئەوەی بە پارەکەی جلوبەرگ و خۆراك بکڕێت ، وە پێی ناخۆش بوو بچێتە نێو کۆشکی سپی لە کوفە بەڵکو ئەو شوێنەی هەڵبژارد کە هەژاران تیایدا دەژیان ، هات بۆ ئەوەی وابژی کە نضری کوڕی منصور لە عقبەی کوڕی علقمە دەگێڕێتەوە و دەڵێت : چووم بۆماڵی علی ـ علیه السلام ـ لەبەر دەستیدا ماستێکی ترشم بینی ، و پارچە نانێکی وشك ، کە لێم خوارد ترشییەکەی ناڕەحەتی کردم ، وتم : ئەی کاربەدەستی باوەڕداران ! ئەمە دەخۆیت ؟ پێی وتم : ابو الجنوب ! پێغەمبەری خودا لەمە وشکتری دەخوارد و لەمە زبرتری لەبەر دەکرد ـ ئاماژەی بۆ جلوبەرگەکەی کرد ـ ئەگەر ئەوەی ئەو پێی هەستاوە بە ئەنجامی نەگەیەنم دەترسم پێی نەگەم ، یان وەك ئەوەی هارونی کوڕی عەنتەرە لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە دەڵێت : چووم بۆ ماڵی علی لە (خەوەرنەق) ، لەوەرزی زستاندا جلێکی ڕزیوی قەدیفەی لەبەر دابوو !پێم وت : ئەی کاربەدەستی باوەڕداران ! خودا بەشی تۆ و ماڵ و منداڵتی داناوە لەم ماڵە ، تۆش وا لەخۆت دەکەیت ؟ وتی : سوێند بە خودا هیچم لەو ماڵەی ئێوە نەبردووە ، ئەوە ئەو قەدیفەیەیە کە لە مەدینەوە هێناومە .

علی ئەوەی بەسەر خۆی و ماڵ و منداڵیدا نەدەهێنا ، ئەگەر زانیبای کە ئاین لەوە زیاتری بۆ حەڵاڵ کردووە ، وە پێویست نییە دونیا نەویستی و خۆگرتنەوە و ناڕەحەتی ژیان ، وە بەشی لە ماڵی موسڵمانان چەندان ئەوەندەی ئەوە بوو کە دەیبرد ، وە مووچەکەی وەك ئەوەی کە کاربەدەستی باوەڕداران و خزمەتێکی گشتی ڕادەپەڕێنێت ، لەوە زیاترە ئەگەر بیەوێت بیبات وەك ئەوەی عمر دیاری کردبوو بۆ هەندێك لەبەرپرسەکانی لە هەرێمەکان ، شەش

---

[٣٢] ئەهلی سوننەت لەسەر دەمی هاوەڵانەوە ڕستەی (صلی الله علیه وسلم ) بۆ پێغەمبەری خودا ﷺ و ڕستەی (رضي الله عنه) بۆ هاوەڵان بەبێ جیاواز لە نێوان هیچ کەسیان و تایبەت کردنی بەزاراوەیەك و ڕستەی (رحمه الله) بۆ زانایان و پێشنینان بەکار هێناوە ، ئیبن تیمیە (رحمه الله) پرسیاری لێکرا دەربارەی کەسێك ناوی علی (رضي الله عنه) بهێنێت بڵێت (صلی الله علیه وسلم) ئایە دروستە تایبەتی بکات بەو نزایە ؟ لەوەڵامدا وتی : بۆ هیچ کەس نییە سەڵەوات تایبەت بکات بۆ هیچ کەس جگە لە پێغەمبەری خودا ﷺ ، وە ئیبن کثیر لەو بارەیەوە دەڵێت : ئەم زاراوەیە لای زۆرێك لە نووسەرەکان بەکاردەهێنرێت کە تەنها بە علی بڵێن (علیه السلام ) یان ( كرم الله وجهه )بە تایبەت جگە لە هاوەڵان ، ئەوە ئەگەرچی ماناکەی ڕاستە بەڵام پێویستە هاوتای بکرێن لە نێوان هاوەڵاندا ، چونکە ئەوە ڕێزگرتن و گەورەکردنە ، هەردوو شێخەکە (ابوبکر و عمر) و ئەمیر مؤمنین عثمان شایانترن لە پێش علی خودا لە هەموویان ڕازیبێت ، دیسان ئیبن تیمیە دەڵێت : پێویستە علی تایبەت نەکرێت بەو زاراوەیە (علیه السلام) بەڵکو پێویستە بوترێت لە ئاستی علی و هەریەکە لە هاوەڵان(رضي الله عنه) یان (رحمه الله) لەبەر ئەوەی بەڵگە نییە کە ئەو زاراوەیە تایبەت بکات بە علی ، وە باشتروایە وەکو خەلیفە ڕاشدییەکانی تر مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت وە تایبەت نەکرێت بەشێك بەتەنها جگە لە هەمووان بە زاراوەگەلێك کە بەڵگەی لەسەر نەبێت(مجموع الفتاوی : ٥٠١/٦) ، وە پێویستە بزانرێت ئەو زاراوانە لە ئەدەبیاتی شیعە هاتووەتە نێو نووسینی هەندێك نووسەر .(وەرگێڕ)

سەد درهەمی دیاری کردبوو بۆ عەمماری کوڕی یاسر و یارمەتی دەرەکانی لە مانگێکدا کاتێك کردیە والی کوفە ، زیاتری پێدەبەخشی کاتێك زیاتری ببەخشیایە بە هاوکارەکانی ، و نیو کاوڕ و نیو تورەکە ئاردی دەدانێ ، وە سەد درهەم و چارەکە مەڕێکی بۆ عبداللەی کوڕی مسعود دیاری کردبوو بە هۆی فێرکردنی خەڵك و بەڕێوەبردنی (بیت المال) لە کوفە ، وە بۆ عثمانی کوڕی حنیف سەد و پەنجا درهەم و چارەکە مەڕێکی دیاری کردبوو لە ڕۆژێکدا لەگەڵ بەخشینی پێنج هەزار درهەم پێی ساڵانە ...

علی چی بەخۆی دەکات ، ئەوەی دەکرد لە کاتێکدا بێئاگا نەبوو لە هەموو ئەوانە ، بەڵکو دەیزانی کە کاربەدەست جێی گومانە و چاوی لەسەرە ، جێ گومانی ڕابواردن و شانازی کردنە بەماڵی گشتییەوە ئەگەر لە ژێر دەسەلاتیدا بوو ، و چاولێکراوە و سەرمەشقی بەرپرسان و خەڵکەکەشیەتی لە خۆگرتنەوە و خۆش نەژیان ، نەفسی خۆی گرت بەوەی ابوبکر و عمری لەسەر بوون لەم بوارەدا ، ئاسۆی بەرز شایەنتر بوو بە خەلیفەکانی پێغەمبەری خودا لە ئاینی خودادا ، وە علی ـ کرم الله وجهه ـ لەسەر ئەو ڕێگەیە ڕۆشت کە شێوازی حوکمڕانی گەڕاندەوە بۆ ئەو شێوازەی کە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ دایڕشتبوو و هەردوو خەلیفەکەی دوای ئەویش لەسەری بوون... ) .

**سەیری ئەو عەقڵیەتە بکە کە ئەم درۆ هەڵبەستراوانەی ڕافیزە پشتڕاست دەکاتەوە و قەبوڵی دەکات و قسەی لەسەر دەکات و پشتگیری دەکات ، وە علی وا وێنا دەکات کە ڕاهبێکی ڕۆچوو یان صۆفییەکی خۆکوژ بووە ، بەڵام علی پارە و زەوی زۆر و چەندان ژن و چەندان کەنیزەك منداڵ و خزمەتکار و دار و دەستە هەبوو کە لەگەڵ برا هاوەڵە دەوڵەمەندەکانی لەو سنوورە دەرنەچوون کە خودا حەڵاڵی کردبوو بۆیان :** ﴿ قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ ٱللَّهِ ٱلَّتِىٓ أَخْرَجَ لِعِبَادِهِۦ وَٱلطَّيِّبَٰتِ مِنَ ٱلرِّزْقِ ۚ قُلْ هِىَ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا خَالِصَةً يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴿٣٢﴾ ﴾ [الأعراف] **واتە : ئەی محمد ﴿ﷺ﴾ بڵێ بە مشریك و بێباوەڕەکان کێ ئەوەی کە خودا حەڵاڵی کردووە لە جل و بەرگ و خواردن و خواردنەوە حەرامی دەکات ، ئەوانە دروست کراون بۆ ئەوانەی باوەڕیان هێناوە لە ژیانی دونیا ئەگەرچی بێبڕواکانیش سوودی لێوەردەگرن ، بەڵام لە ڕۆژی دواییدا تایبەتە بە باوەڕداران و حەرامکراوەلەسەر بێبڕواکان . ( وە سەیری کتێبی . مطاعن سید قطب في أصحاب رسول الله ﴿ﷺ﴾ بکە)**

**وتارێك كە هەڵبەستراوە بۆ علی(رضي الله عنه) كە تێیدا هاتووە كە هەموو بەخشراوەكانی عثمان دەستی بەسەردا گیراوە وە خەڵك تاوانبار دەكات بەوەی سوودمەند بوون و بانگەشەی ئەوەی ئەوەی كە علی ئەو ڕوحە بۆ ئاین دەگێڕێتەوە كە لەسەر دەمی عثماندا لە ناو چوو بوو**

سەیید قوتب دەڵێت (ل ١٦٣ ـ ١٦٤): ( وەئەو بەرنامەی كە دایڕشت ئەوە بوو كە لە وتارەكەیدا ئاشكرای كرد دوای ئەوەی بەیعەتی پێدرا : ئەی خەڵكینە ، من پیاوێكم لە ئێوە ، ئەوەی بۆ من هەیە بۆ ئێوەش هەیە ، وە ئەوەی لەسەر منە لەسەر ئێوەشە ، وە من بەوە حوكم ڕانیتان بۆ دەكەم لەسەر بەرنامەی پێغەمبەرەكەتان وە ئەوە بە ئەنجام دەگەیەنم كە فەرمانم پێكراوە ..هەرچی بڕیارێك عثمان داویەتی ، وە هەر پارەیەك كە داویەتی لە ماڵی خودا ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ (بیت المال) ، حەق هیچ شتێك پوچەڵی ناكاتەوە ، ئەگەرچی بینیم كە ژنی پێ خوازراوە و كەنیزەكی پێكڕاوە ، و لە شارەكاندا بڵاوەی پێكراوە دەیگێڕمەوە ، چونكە دادپەروەری فراوانە و ئەوەی تەسكی بكاتەوە ستەم لەسەری تەسكترە .

ئەی خەڵكینە ..با كەسانێك لە ئێوە سبەی نەڵێت ـ دونیا نغرۆیكردن وبوونە خاوەن موڵك و ڕووباریان هەڵگۆزی ، سواری ئەسپ بوون ، و جلوبەرگی ناسكیان لەبەر كرد ـ ئەگەر گرتنمەوە لەوەی كە تێیدا ڕۆچوو بوون ، و ئەو مافانە وەربگرمەوە كە دەیزانن : كوڕەكەی أبوطالب مافەكانی زەوت كردین ، وە هەركەسێك لە كۆچەرییەكان و پشتیوانەكان وابیبنێت كە بەهۆی هاوەڵبوونیەوە فەزڵی هەیە بەسەر خەڵكی تردا ، بابزانن كە فەزڵ و پاداشت سبەی لای خودایە ، وە هەركەسێك وەڵامی خوداو پێغەمبەرەكەی بداتەوە و ئوممەتەكەمان بەڕاست بزانێت و بێتە نێو ئاینەكەمانەوە و ڕوو لە قیبلەكەمان بكات ، ئەوە هەموو ماف و سنوورەكانی ئیسلام دەیگرێتەوە ، ئێوە بەندەی خودان و ماڵیش ماڵی خودایە ، بە یەكسانی لە نێوانتاندا دابەش دەكرێت وە هیچ كەس فەزڵی نییە بەسەر كەسدا ، و لە خودا ترسان لای خودا باشترین پاداشتیان بۆ هەیە .

زۆر ئاسایی بوو كە خاوەن بەرژەوەندییەكان ڕازی نەبن لە علی ، و یەكسانیان لا پەسەند نەبێت چونكە وا ڕاهاتبوون كە لە خەڵك باشترن و فەزڵیان هەیە ، وە دەبێت تەنها ئەوان سوودمەندبن ، ئەو جۆرە كەسانە لە كۆتاییدا بوونە لایەنگیری بەرەكەی تر ، بەرەی ئومەویەكان كە لەوێدا ویست و ئارەزووەكانیان دەستەبەر دەبوو ، لەسەر حیسابی دادپەروەری و حەق كە علی(رضي الله عنه) داكۆكی لێدەكردن و جەختی لەسەر دەكردنەوە !

وە ئەوانەی كە لە موعاویەدا زیرەكی و لێهاتوویی دەبینن كە لای علی نەبووە ، دەڵێن لەبەر ئەوەشە موعاویە لە كۆتاییدا سەركەوت ، بەڵكو ئەوانە هەڵوێست و كات و شوێنەكە بە هەڵە هەڵدەسەنگێنن ، ئیشی سەرەتا و كۆتای علی ئەوەبوو ، كە هێز بۆ نەریتە ئیسلامیەكان بگێڕێتەوە ، و ڕۆحیان بكاتەوە بەبەردا ، وە ئەو تاریكیە بڕەوێنێتەوە كە باڵی بەسەر ئەم ڕۆحەدا كێشابوو لەسەر دەستی ئومەویەكان لەپیری عثماندا ، وە ئەگەر ئامرازەكانی ئومەویەكانی بەكارهێنابا ئەوكات گرنگی ڕاستەقینەی پووچەڵ دەبوویەوە ، وە كاتێك ماندوو بوو بۆ بەدەستهێنانی خەلافەت بە پاكی بۆ نرخی ژیانی ئەم ئاینە ، علی یان دەبێت علی بێت یان با خەلافەتی لەدەست بچێت ، بەڵكو با ژیانیشی لەگەڵدا تیابچێت ، ئەوە تێگەیشتنی دروستە كە لێی شاراوە نەبوو ـ كرم الله وجه ـ كە دەیگوت : ـ كە لێوەی دەگێڕنەوە ئەگەر ڕیوایەتەكە صەحیح بێت ـ : سوێند بە خودا موعاویە لەمن ژیرتر نییە بەڵام ئەو ناپاكی و خراپەكاری دەكات ، وە ئەگەر لەترسی ناپاكی نەبووایە من لە ژیرترینی خەڵك بووم ).

**باسی ناڕەوای سەردەمی ئومەویەکان و عەباسیەکان لەسەر ڕێبازی ڕەوافز و خەوارج**

دەڵێت(ل١٦٤ـ ١٦٥) : ( علی کۆچی کرد و چوو بۆ لای بەزەیی پەروەردگاری ، و ئومەوییەکان هاتن ، ئەگەر لە پێشدا باوەڕ و دونیا نەویستی و دڵناسکی عثمان ڕێگر بوو لە ئومەوییەکان .. ئەو ڕێگرە داڕما و .. و ڕێگە والابوو بۆ بەلاڕێدا چوون .

ڕووبەری دەسەلاتی ئیسلام دواتر فراوان بوو ، بەلام ڕۆحیەتەکە کرژ بوویەوە و قەتیس بوو بە دڵنیاییەوە ، و بەشێکی زۆر لە توانا ڕۆحیەکەی لە دەستدا بەلام هێشتا وزەیەکی شاراوەی تێدا بوو بۆ سەرکەوتن .

بەلام لەسەردەمی ئومەویەکانەوە سنووری (بیت المال) فراوان بوو ، ئیدی بووە تالانییەکی حەلاڵ بۆ پادشا و دارودەستە و ماستاوچیەکان ، و یاسا توندەکانی دادپەروەری ئیسلام درزی تێکەوت ، ئیدی بۆ کاربەدەستان بەرژەوەندی و بۆ پاشاکۆکانیان قازانج و دەوردەستەکانیان سەرانە هەبوو ، وە خەلافەت بوو بە پادشایەتی پادشایەتیەکی ستەم و ناڕەوا ، وەك چۆن پێغەمبەر(ﷺ) باسی دەکات لە یەکێك لە وتە ناسك و کۆواتا ڕۆحیە قوڵەکانی .

دەگەڕێینەوە و ئەو بەخشینانە دەبیستین کە دراوە بە ماستاوچی و گۆرانی بێژ و سەماکەران ، یەکێك لە پادشا ئەمەویەکان دوازدە هەزار دیناری دایە معبد ، وە هارون الرشید ـ یەکێکە لە پادشاکانی عەباسییەکان ـ چوار هەزار دینار و خانوویەکی بەنرخ و پۆشاك و ناوماڵەیەکی جوانی بەخشیە اسماعیلی کوڕی جامعی گۆرانی بێژ بۆ گۆرانیەك کە وتبووی ، ئەو تەوژمە بەو ئاڕاستەیە ڕێگەی دەبڕی چەند کاتێکی کەم نەبێت جیاواز بوو لەو بارە .

پێوستە لێرەدا باسی سەردەمی عومەری کوڕی عبدالعزیز بکەین (رضي الله عنه) کە پاشماوەی سەردەمی ڕاشدیەکان بوو ، و تیشکێکی ڕووناك بوو ڕێگەی ڕۆشن کردەوە ، سەردەمەکەی بەوە دەستی پێکرد کە حوکمی بە زۆر داگیرکراو بگەڕێنێتەوە بۆ خاوەن حەقە یەکەمینەکانی : بۆ ئوممەتی موسڵمان کە پێویستە پێشەوای خۆی ئازادانە هەڵبژێرێت نەوەك بەزۆری سەرباز ، یان بەزۆری پارە ... چووە سەرمینبەر و وتی : ئەی خەڵکینە من گیرۆدەی ئەم کارە بووم بەبێ ئەوەی ڕای منی لەسەر بێت ، و داوای بکەم ، و پرس و ڕا بە موسڵمانان کرابێت ، وە ئەو بەیعەتەی لە گەردنی ئێوەدایە ئێوە ئازادن یەکێك بۆ خۆتان هەڵبژێرن ، خەڵك هاواریان کرد تۆمان هەڵبژارد ئەی کاربەدەستی باوەڕداران ، وە بە تۆ ڕازین ، دەست پێبکە لەسەر بەرەکەتی خودا .

بەوەش کاری گێڕایەوە ڕێڕەوی خۆی لە حوکمڕانیدا ، هیچ کاربەدەستیەك شەرعی نابێت بەبێ شورا و ڕەزامەندی و قبوڵکردن .

لەو ساتەدا وتاری بۆ خەڵکدا و وتی : ئەی خەڵکینە لە پێش من کاربەدەستان سەرنجیانتان ڕادەکێشا بۆ ئەوەی ستەمیان لە خۆتان دوور بخەنەوە ، گوێڕایەڵی دروستکراو ناکرێت لە سەرپێچی دروستکەر ، ئەوەی گوێڕایەڵی خودا بکات گوێڕایەڵی پێویستە ، و ئەوەی سەرپێچی خودا بکات گوێڕایەڵی ناکرێت ، گوێڕایەڵیم بکەن هەتا گوێڕایەڵی خودا بووم ، ئەگەر سەرپێچی خودام کرد ئەوا هیچ مافم نییە بەسەرتانەوە تا گوێڕاڵیم بکەن ....

کاتێك دەستی بەکارەکەی کرد ئەو شتانەی بەستەم برابوون گەڕاندییەوە و سەرەتا لە خۆیەوە دەستی پێکرد )

.

**دواتر چەند ڕیوایەتێکی هێناوە کە ڕاست نین و سەرچاوەکەی . خودا زاناترە . لە ڕەوافزەکانەوەیە .**

## وتارێکی هێناوە کە بە درۆ دراوەتە پاڵ موعاویە و المنصور کەس ئەوە بەڕاست نازانێت ڕەوافزەکان و هاوشێوەکانیان نەبێت

سەییدقوتب دەڵێت (ل ١٦٧ ـ ١٦٨):( ئەگەر چی ئێمە لێرە مێژوو بۆ دەوڵەتی ئیسلامی نانووسینەوە ، بەڵکو بۆ ڕۆحی ئیسلامی لە حوکمدا ، ئێمە لێرە ئاماژە بۆ سێ وتار دەکەین لەسەردەمی پادشاکان بۆ ئەوەی ئەو گۆڕانکاریانە ڕوون بکەینەوە ، هاوتەریبی بکەین لەگەڵ سێ وتاری خەلیفەکان کە پێشتر باسکران جیاوازی قووڵ دەردەکەوێت .

موعاویە وتارێکی بۆ خەڵکی کوفە خوێندەوە دوای ئاشتەواییەکە وتی : ئەی خەڵکی کوفە ! وا گومان دەبەن دەجەنگم لەگەڵتان بۆ ئەوەی نوێژ بکەن و زەکات بدەن حەج بکەن ، وە من دەزانم ئێوە نوێژ دەکەن و زەکات دەدەن و حەج دەکەن ؟ بەڵکو دەجەنگم لەگەڵتان بۆ ئەوەی ببمە فەرمانڕەواتان و ملکەچتان بکەم ، وە خودا ئەوەی پێداوم ، ئێوە پێتان ناخۆشە ، هەرچی ماڵ و خوێنێك کە لەم فیتنەیەدا تیاچووە بە فیڕۆ چوو ، وە هەرچ مەرجێك دانرابێت لە ژێر هەردوو پێم دایە .

( وە وتاری بۆ خەڵکی مەدینە خوێندەوە و وتی : دواتر ، سوێند بە خودا من نەبوومەتە فەرمانڕەواتان بە ڕەزامەندیتان و خوشویستنتان بۆمن ، بەڵکو بەم شمشێرەکەم جەنگام لەگەڵتان ، نەفسم کردەوەی کوڕی أبو قحافەی پێباشە بۆتان ، وە من ویستم وەك کردەوەی عمر بێت ، بەڵام زۆرێك ناڕازی بوو ، وە ویستم وەك کردەوەکانی عثمان بێت علی نەیویست ، ڕێگەیەکم گرتە پێش سودی من و ئێوەشی تێدایە ، خواردنی باش و خواردنەوەی بەتام ، وە ئەگەر ئێوە من بە باشترینتان نازانن ، ئەوا من لە فەرمانڕەواییدا لە ئێوە باشترم ...).

وە المنصوری عەباسی وتارێکی خوێندەوە ، لە کاتێکدا کە تەوژمی ئومەویەکان شێوازی حوکمڕانی گۆڕیبوو تا عەباسیەکان کۆتاییان پێهێنان بە بیردۆزی مافی پەروەردگاری پیرۆز کە ئیسلام نایزانێت ، وتی : ( ئەی خەڵکینە : من دەسەڵاتی خودام لەسەر زەوی خودا ، بەڕێوەتان دەبەم بە یارمەتی و پشتیوانی ئەو ، وە من چاودێری ماڵی خودام ، بەویست و ئیرادەی ئەو کاردەکەم ، وە دەبەخشم بە ڕێگە پێدانی ئەو ، خودا منی کردۆتە کلیلێك لەسەر ئەو ماڵە ، ئەگەر ویستی بمکاتەوە دەمکاتەوە بۆ پێدان و بەشی ڕۆزیتان ، وە ئەگەر ویستی کلیلم بدات ئەوە دامدەخات)! .

بەوەش سیاسەتی حوکمڕانی بە هەموو شێوەیەك لە بازنەی ئیسلام و فەرمایشتەکانی دەرچوو .

سیاسەتی دارایی شوێنکەوتەی سیاسەتی حوکمڕانی بوو ، وە ئاماژەیەك بوو لە دیدی فەرمانڕەواکان بۆ حوکمڕانی و شێوازی بەڕێوەبردنی ، مافەکانی فەرمانڕەواکان و خەڵك .

بەڵام لە ژیانی محمد ﷺ و دوو هاوەڵەکەی و علی کوڕی ابو طالب ، بۆچوونی باو بۆچوونی ئیسلامی بوو ، ئەویش ئەوە بوو کە ماڵی گشتی ماڵی هەمووانە و فەرمانڕەوا بۆی نییە نەخۆی و نەخزم و کەسوکاری هیچی لێببەن ئەوە نەبێت کە مافیانە ، وە بۆی نییە هیچی لێببەخشێت بەکەس بە ئەندازەی ئەوەی نەبێت کە شایەنییەتی ، وەك هەرکەسێکی تر ، کاتێك ئەم بۆچوونە کەمێك تووشی لادان بوو لەسەردەمی عثماندا ، خەڵکی مافەکانیان هێشتا ڕەچاو دەکرا ، وە خەلیفە واتێگەیشت کە ئازادە ـ دەست گوشادی کرد لە پارە و ماڵدا لە پێداویستیەکانی خەڵك ـ دەست وەربداتە ئەو ماڵە و چاکەی پێبکات لەگەڵ کەسوکاریدا ، وە هەرکەسێکی تر کە خۆی بیەوێت .

بەڵام کاتێك حوکمڕانی بووبە پادشایەتی ستەم و ناڕەوا ئەوکات سنوورەکان بەزێنران و هیچ بەربەستێك نەما ، و فەرمانڕەواکان دەست کراوە بوون لە بەخشین و گرتنەوە ، بە حەق کەمجار و بەناحەق لەزۆر کاتدا ، ماڵی موسڵمانان بەکارهێنرا بۆ ڕابواردن لەلایەن کاربەدەستان و منداڵ و پاشکۆ و ماستاوچییەکانەوە بەبێ سنوور ، بەوەش کاربەدەستان بۆ دواجار لە سنوورەکانی ئیسلام دەرچوون لە ماڵدا .

## ڕۆچوونی لە علی و پەکخستنی خەلافەتی عثمان و ئەوەی کە خەلافەتەکەی بۆشاییەك بوو لە نێوان دوو خەلیفەکەی پێش خۆی و علی دا

سەییدقوتب دەڵێت (ل١٧٢ ـ ١٧٣) : ( ئەوە دوو ڕایە لە دابەشکردنی ماڵدا ، ڕای ابوبکر و ڕای عمر ، ڕاکەی عمر (رضي الله عنه) پاڵپشتی هەبوو : ئەوەی کە دژی پێغەمبەر ﷺ جەنگاوە وەك ئەوە نییە کە لەگەڵیدا جەنگاوە ، و... ، کەواتە هەرکەسە و ماندوو بوونی لە ئیسلامدا ...، لەبەر ئەوە یەکسانی دەکرد لە نێوان ماندوو بوون و پاداشت ، هەروەها ڕاکەی ابوبکر پاڵپشتی هەبوو : ئەوانە لەبەر خودا موسڵمان بوون پاداشتیان لای خودایە ، لە ڕۆژی دواییدا پاداشتیان دەداتەوە ، وە ئەم دونیایە تەنها ئاگادارکردنەوەیە ، ئێمە ڕاڕا نابین لەوەی کە بۆ چوونەکەی ابوبکر هەڵبژێرین چونکە شایان ترە بەوەی یەکسانی لە نێوان موسڵماناندا فەراهەم بکات ـ ئەوەش بنچینەیەکی گەورەی ئەم ئاینەیە ـ ، وە شیاو ترە بۆ ئەوەی ئەو دەرئەنجامە خراپانەی لێنەکەوێتەوە وەك لەوەی لە نایەکسانی دەکەوێتەوە ، وە ئەو هەڵئاوسانە کە ساڵ بەساڵ بە وەبەرهێنان زیاد دەکات ـ وە ئەوەی کە لە ئابووری زانراوە ئەوەیە زیادکردنی قازانج هاوڕێژەیە تاڕادەیەکی زۆر لەگەڵ زیادکردنی سەرمایە ـ ئەو ئەنجامانەی کە عمر لە کۆتا ڕۆژەکانی ژیانیدا بینی کە بە خشینەکانی بە یەکسانی بێت ئەو وتە بەناوبانگەی گوت : ئەگەر ئەوەی ئێستا بۆم دەرکەوتووە پێشتر زانیبام ئەو پارە زیادەیەم لە دەوڵەمەندەکان وەردەگرت و دابەشم دەکرد بەسەر هەژارەکاندا !

بەڵام بەداخەوە ! کاتەکان بەسەر چوون ، و ڕۆژگار پێش عمر کەوت ، و ئەو دەرئەنجامە کاریگەر و ترسناکانە کەوتنەوە کە هاوتایی لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا تێکدا ، وەك چۆن دواتر فیتنەی لێکەوتەوە ، بەوەی کە مەروان خستیە سەر ئەو بارە و عثمانیش پێڕازی بوو ![٣٣]

عمر لەو ڕایەی پەشیمان بوویەوە لە جیاوازی کردنی لە بەخشینەکانی لە نێوان موسڵماناندا ، کاتێك دەرئەنجامە خراپەکانی بینی و چووە سەر ڕاکەی ابوبکر ، هەروەها ڕای علی هاوڕای خەلیفەی یەکەم بوو ـ وە ئێمە وای دەبینین کە خەلافەتی علی (رضي الله عنه) درێژکراوەیەکی سروشتی خەلافەتی دوو خەلیفەکەی پێش خۆیەتی ، وە سەردەمی عثمان کە مەروان تیایدا فەرمانڕەوا بوو ، بۆشایی بوو لە نێوانیان ـ لەبەر ئەوە درێژە بە باسی سەردەمی علی دەدەین دواتر دەگەڕێینەوە سەرباسی ئەو دیاردەیە لە ڕۆژگاری عثماندا .

علی بنەمای یەکسانی هەڵبژارد لە بەخشیندا ، وەك لە وتاری یەکەمیدا باسیکرد و وتی : هەرکەسێك لە کۆچەریەکان و پشتیوانەکان وادەبینێت کە بەهۆی هاوەڵ بوونەیەوە فەزڵی هەیە ، ئەوە فەزڵ سبەی لای خودایە ، و پاداشتی لای خودایە ، وە هەرکەسێك وەڵامی خودا وپێغەمبەرەکەی بداتەوە ، وە ئوممەتەکەمان بەڕاست بزانێت

---

(٣٣) [لێرەوە دەردەکەوێت کە سەیید باوەڕی بە یەکسانی ڕەها هەیە ئەمەش بنچینەیەکی سۆسیالیستی خراپە ، کە لە حەقیقەتدا قسە وتنە بە عومەر خودای لێڕازیبێت ](م.خلیل أحمد).

، و بێتە نێو ئاینەکەمان ، و ڕوو لە قیبلەکەمان بکات ، ئەوا هەموو ماف و سنوورەکانی بۆ پێویست دەبێت ، ئێوە بەندەی خودان ، و ئەوماڵەش هی خودایە ، دابەش دەکرێت لە نێوانتاندا بە یەکسانی[٣٤]، وە هیچ کەس لەوەدا فەزڵی نییە بەسەر کەسێکی تردا ، وە خۆپارێزە لە خودا ترسەکان باشترین پاداشتیان بۆ هەیە لای خودا .

ئەمە بنەمایەکی ئیسلامی دروستە کە کۆکە لەگەڵ ڕۆحی یەکسانی ئیسلامیدا ، وە هاوتایی دەستەبەر دەکات بۆ کۆمەڵگەی ئیسلامی ، و ڕێگە نادات سەرمایەکان زۆربن بە ئەندازەی ماندوو بوون و کارکردن نەبێت ، نەك بە ڕێگە پێدانی کەسێك بەڵام ئەوانی تر ئەو هەلەیان بۆ نەڕەخسێت ، بە بوونی سەرمایەیەکی زۆر بۆ کارکردن کە ئەو سەرمایە لای کەسانی تر نەبێت[٣٥].

عمر لە دواڕۆژەکانی ژیانی بە نیازبوو کە ڕەچاوی ئەم بنەمایە بکات ، بەڵام شەهید کرا و ئەو مەبەستەی کە هەیبوو پیادەی نەکرد : مەبەستی ئەوە بوو کە ئەو پارە زیادەی لای سەرمایە دارەکان هەبوو لێیان وەربگرێت و دابەشی بکات بەسەر هەژارەکاندا ، چونکە ئەو زیادانە ـ زۆر جار ـ لە جیاوازی بەخشینەکانەوە سەرچاوەی گرتبوو ، وە ویستی یەکسانی ڕەچاو بکات لە بەخشینەکانی بۆ ئەوەی ئەو جیاوازیانە سەرهەڵنەدات وەك پێشتر سەری هەڵدابوو ، وە بۆ ئەوەی کۆمەڵگەی ئیسلامی تووشی لێك ترازان و ناتەبایی نەبێت وەك سەرەتای دەرکەوتبوو ).

## تانەدانی لە عثمان و درۆ بۆ هەڵبەستنی لە ڕوانگەی سۆسیالیستیەوە و تانەدانی لە پیاو ماقووڵانی قورەیش

لە (ل١٧٣) : دەڵێت : ( عثمان هات ئەو دوو ڕێبازەی خەلیفەکانی پێش خۆی نەبرد و کاری بەهیچ یەکێك لەوانە نەکرد ... ئەو ماڵە و سامانە زیادانەی کە هەبوون نەیگەڕاندەوە ، وە بەخشینەکانی هەر بەو جیاوازیانە هێشتەوە ، بەڵام ئەمە هەموو شتەکان نەبوو ، بەڵکو دەست گوشادی کرد لە بەخشین بەسەر خەڵکدا ، دەوڵەمەندەکان زیاتر دەوڵەمەند بوون ، وە لەوانەیە هەژارەکانیش کەمێك بوژابنەوە ، ئیدی بەخشینی گەورەی دەبەخشیە کەسانێك کە بێ سەرمایە نەبوون ، دواتر قورەیشی ئازاد کردبوو کە بە تان و پۆی زەویدا بگەڕێن و بازرگانی بە سەرمایە کۆکراوەکانیان بکەن ، بۆ ئەوەی ئەو سەرمایەیانە چەندان جار زیاتر بکات ، دواتر حەڵاڵی کرد بۆ دەوڵەمەندەکان موڵك وماڵیان هەبێت لە شارەکان و گوندەکان ، تاوای لێهات کۆمەڵە سەرمایەدارێکی گەورە بوونە سەرکردەی کۆمەڵگەی ئیسلامی لە کۆتاییەکانی سەردەمەکەی خودا ڕەحمی لێبکات .

ابوبکر و عمر لەپێش عثمان ڕێگربوون لە سەرکردەکانی قورەیش لە مەدینە و نەیان دەهێشت بە تان و پۆی زەویدا بچن ، بۆ ئەوی ئەو سەرکردانە چاو نەبڕنە ماڵ و بەرپرسێتی کاتێك یاریدەدەریان بۆ کۆ دەبێتەوە بە هۆی ئەوەی خزمی پێغەمبەری خودان ، یان بە هۆی ئەوەی کە تووشی بوون لەسەر ئیسلام و جیهاد و تێکۆشان و پێشەنگییان ، ئەمە ئاستەنگ خستنە پێش ئازادی تاکە کەسی نییە وەك ئیسلام تێی دەگات ، ئەم ئازادیە وابەستە و سنووردارە بە بەرژەوەندی کۆمەڵگە و ویستنی چاکەیان .

---

[٣٤] [ئەمە دەری دەخات کە سەیید سۆسیالیستیە ](م.خلیل أحمد).

[٣٥] [لە هیچ کوێی ئیسلامدا ئەمە قەدەغە نەکراوە ، ئەگەر کەسێك بە هەوڵی خۆی سامانی لا کۆ ببێتەوە ] (م.خلیل أحمد).

کاتێك عثمان هات حەڵاڵی کرد بۆیان بڕۆن بە تان و پۆی زەویدا ، تەنها لەوەدا ڕەهای نەکردن بەڵکو ئاسانکاری بۆکردن و یارمەتیدان بۆ وەگەڕخستنی سەرمایەکانیان لە موڵك و ماڵدا لە هەرێمەکان ، دوای ئەوەی کە بەخشیە هەندێکیان سەدەها هەزار .

هەموو ئەوانە چاکە و بەزەیی بوو بۆ موسڵمانان ، بەڵام ترسێکی گەورەی سازاند ، کە شاراوە نەبوو لە ژێری ابوبکر ، وە ژێری عمر دوای ئەو ، کە جیاوازییەکی زۆری مادی و کۆمەڵایەتی لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا دروستکرد ، وە هەروەها چینێکی دروست کرد کە ڕۆزی لە هەموو لایەکەوە بۆ دەهات بەبێ ئەوەی هیلاك و ماندوو بێت ، ئەو خۆشگوزرانییە[٣٦]کە ئیسلام دژایەتی دەکرد بە دەقەکانی و ڕێنماییەکانی ، وەك چۆن دوو خەلیفەکەی پێش عثمان دژایەتیان دەکرد ، لەبەر ئەوەی تێدا ڕۆنەچن ) .

## پیا هەڵدانی بەوانەی شۆڕشیانکرد دژی عثمان وە درۆ هەڵبەستنی بۆ ابو ژر کە لەوانە بووە ، و وتارێکی شۆڕشیانەی بۆ هێناوە ، کە تانە لە عثمان و ئومەوییەکان دەدات وە لەوانەی کە ناویان دەبات بە خۆشگوزەرانەکان لە گەورە هاوەڵانن

سەیید دەڵێت(ل ١٧٤ ـ ١٧٥) : ( لەو کاتە دا ڕۆحی ئیسلامی هەڵقوڵا لە دەروونی هەندێك لە موسڵمانان ، کە توندترین و گەرمترینیان أبو ذر بوو ، ئەو هاوەڵە بەڕێزەی کە دەستەی فەتوای میسری لەم دواییانە لەو بۆچوونەی بەهەڵەیان خستەوە ، وەك ئەوەی بڵێن ئێمە لە ئاین شارەزاترین لە ئەو ! دواتر ئەو دەستەیە ـ لە بۆنەیەکی تردا ـ پەشیمان بونەوە و فەتوایەکی تریان دەرکرد بەوەی کە بۆ چوونەکەی ڕاست بووە ! وەك ئەوەی بڵێن ئاینی خودا کاڵایەکە بازرگانی پێوە دەکەین لە بازاڕی ئارەزووەکانیان .

ابو ذر هەستا دژایەتی ئەو خۆشگوزەرانانەی دەکرد خۆشگوزەرانیەك کە ئیسلام پێی نەهاتووە ، وە نکولی ئەو سیاسەتی خۆشگوزەرانییەی لە موعاوییە و ئومەوییەکان بەتایبەت کرد ، کە کارا بوون بۆ زیاتر بوون و زیاتر ڕۆچوون تیایدا ، وە نکولی ئەوەی لە خودی عثمانیش دەکرد لەوەی کە سەدەها هەزار ببەخشێت ، کە ببێتە مایەی زیاتر دەوڵەندبوون و خۆشگوزەرانیان .

زانی کە عثمان پێنج یەکی دەرامەتی ئەفریقای داوەتە مەروانی کوڕی حەکەم ، دوو سەد هەزار درهەمی داوەتە حارثی کوڕی حەکەم ، و سەد هەزاری داوەتە زەیدی کوڕی ثابت ... ویژدانی ابو ذر هیچ لەوانەی قەبوڵ نەکرد ، بۆیە دەچوو وتاری بۆ خەڵك دەخوێندەوە : ( کۆمەڵە کردارێك ڕویداوە من نەم زانیوون ، سوێند بە خودا نە قورئانی خودا ونەسوننەتی پێغەمبەر نین ، سوێند بە خودا من حەقێك دەبینم دەکوژێتەوە و ، ناحەقێك دەبینم زیندوو دەکرێتەوە ، وە ڕاستگۆیەك بەدرۆدەخرێتەوە ، وە ئاسەواری لە خودا نەترسان دەبینم ، ... ئەی دەستەی دەوڵەمەندان دەست گرۆی هەژاران بکەن ، و مژدە بدەن بەئەو کەسانەی کە زێڕ و زیو کۆدەکەنەوە و هەڵیدەگرن و نایبەخشن لە ڕێگەی خودا بە مەنزلگایەك لە ئاگر ، کە نێوچاوان و لاکەشەکان و پشتیانی پێداخ دەکرێت ... ئەی ئەو کەسەی ماڵ و سامان هەڵدەگریت بزانە کە ماڵ سێ هاوەڵی تێدایە : قەدەر پرست پێناکات کە خێر و شەڕی ببات بە لەناوچوون یان مردن ، وە میراتگرەکان چاوەڕوانن سەربنێیتەوە بۆ ئەوەی ماڵەکەت ببەن و تۆش لۆمە

[٣٦] [ئیسلام دژی خۆشگوزەرانی نیە ئەوەی کە دژایەتی دەکات هەلگرانی بیری سۆسیالیستین ](م.خلیل أحمد).

بکرێیت ، تۆش سێیەمی ، هەوڵبدە بێ هێزترینی ئەو سێیانە نەبیت .. خودای پەروەردگار دەفەرموێت : ﴿لَن تَنَالُواْ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبُّونَۚ ﴿٩٢﴾﴾ [آل عمران] ، واتە : تا ئەوەی لە ماڵە باشەکانتان خۆشتان دەوێن نەیبەخشن ، ناگەنە گوێڕایەڵی و کارەباشەکان .

ئێوە پەردەی ئاوریشمتان بەکارهێنا ، وە ئاوریشمی ئەستورتان کردە ڕاخەر ، وە پێتان ناخۆشە لەسەر خوری ئەرزەبی (ئازەربیجانی ) ڕابکشێن ، وە پێغەمبەری خودا لەسەر حەسیر دەنووست ، وە جیاوازم لەگەڵتان بەو هەموو جۆرە خواردنە ، وە پێغەمبەری خودا تێری لە نانی جۆ نەدەخوارد ) .

وە مالکی کوڕی عبداللەی الزیادی لە ابو ذر دەگێڕێتەوە : ( ابو ذر هات ڕوخسەت لە عثمانی کوڕی عفان بخوازێت ، ڕوخسەتی داو کۆچانێك بە دەستیەوە بوو ، عثمان وتی : ئەی کعب ، عبدالرحمن مردووە و ماڵێکی بەجێ هێشتووە ، دەبینی چی پێبکەین ؟ وتی : ئەگەر مافی خودای لێ دابێت هیچی لەسەر نییە ، ابو ذر کۆچانەکەی دەستی بەرزکردەوە و لە کعبی دا ، و وتی : گوێم لە پێغەمبەری خودا ﴿ﷺ﴾ بوو دەیفەرموو : ( ما أحب لو أن لي هذا الجبل ذهباً أنفقه ويتقبل مني، أذر خلفي منه ست أواق ، أنشدك الله يا عثمان. أسمعته ـــ ثلاث مرات ـــ قال : نعم ) ، واتە : حەز ناکەم ئەم شاخەزێڕ بێت و هی من بێت و بیبەخشم و لێم وەربگرێت ، لە دوای خۆم شەش ئوقییەی لێ بەجێ بهێڵم ، ئەی عثمان تو خودا بیستووتە ـ سێ جار ـ وتی : بەڵێ .

هاوشێوەی ئەم جۆرە بانگەوازە موعاویە و مەروانی کوڕی حەکەم پێیان قبوڵ نەدەکرا ، هەردووکیان هاتن عثمانیان لێ هاندا تا خۆی لە (الربذة) بە دوورخراوەیی بینی یەوە بەبێ ئەوەی دژایەتی خودا و پێغەمبەرەکەی بکات ، وە بەبێ ئەوەی ئاشوب و فیتنە لەسەر زەوی بنێتەوە ، وەك چۆن شەریعەی ئیسلامی وا دەفەرموێت !) .

**سەيد قوتب وا دەبينێت كە سياسەتی عثمان بووە مايەی لێك ترازاندنی كۆمەڵگەی ئيسلامی بۆ چەند چينێك ، وە بووە مايەی تێكدانی ئەو بنەمايانەی كە ئەم ئاينە پێی هاتووە هاوپێچ لەگەڵ ئەوەش تانە لەكەسێتی هاوەڵان دەدات**

سەييد دەڵێت (ل ١٧٥ ـ ١٧٦) : ( ئەوە هاواری وێژدانی بەئاگای موسڵمانە كە تەماح و ئارەزوو بەنج و بێهۆشی نەكردووە ، بەرامبەر ئەو زياد بوونە بێ سنوورەی سەرمايە ، كە كۆمەڵگەی ئيسلامی دەكاتە چەند چينێك ، وە ئەو بنەمايانە تێك دەدەن كە ئەم ئاينە هاتووە بۆ ئەوەی دايان بمەزرێنێ و پيادەيان بكات ، لێرە ئەوەندە بەسە چەند وێنەيەك لەو سەرمايە گەورانە بهێنينەوە كە المسعودی[٣٧] هێناويەتی و دەڵێت : ( لەسەردەمی عثماندا هاوەڵان بوونە خاوەن موڵك و ماڵ ، لەو ڕۆژەدا كە كوژرا لای خەزنەدارەكەی سەد هەزار دينار و يەك مليۆن درهەمی هەبوو ، وە نرخی موڵكەكانی لە ( وادی القری و حنين وئەوانی تر ) سەد هەزار دينار بوو ، وە حوشتر و ئەسپێكی زۆری بەجێهێشت ، وە هەشت يەكی ميراتی هەركەسێك لە ماڵە بە جێماوەكانی زوبێر دوای مردنی گەيشتە پەنجا هەزار دينار ، وە هەزار ئەسپ و هەزار كەنيزەكی بەجێهێشت .

پاداشتی ڕۆژێكی طلحە لە عێراق هەزار دينار بوو ، وە لە دەربارەی شتە كەم وێنە و ناياب و گەوهەرەكان لەوە زياتری بوو ، وە عبدالرحمانی كوڕی عەوف هەزار ئەسپ ، و هەزار حوشتر ، و دەهەزار مەڕی هەبوو ، وە چارەكی ئەوەی كە دوای خۆی بەجيهێشت هەشتا و چوار هەزار بوو ، وە زەيدی كوڕی ثابت ئەوەندە زێڕ و زيوی بەجێهێشت كە بەتەور نەدەشكا ئەوە جگە لە موڵك و ماڵ ، وە زوبێر خانوويەك لە بەصرە و يەكێكی تر لە ميسر و كوفە و ئەسكەندەريە دروستكرد ، وە هەروەها طلحە خانوويەكی لە كوفە و يەكێكی تر لە مەدينە بە گەچ و تابوق و داری ساج دروست كرد ، وە سەعدی كوڕی ئەبو وەقاص خانوويەكی لەبەردی عقيق دروستكرد و ديوارەكانی بەرزكردەوە و ڕووبەرەكەی فراوانكرد ، كە لەسەروە باڵەكۆنی هەبوو ، وە ميقداد خانوويەكی لە مەدينە دروستكرد دەرەوە و ناوەوەی گەچ كرد ، وە يەعلی كوڕی منبە لە دوای خۆی پەنجا هەزار دينار و موڵكی بەجێهێشت وە شتومەكی تر كە نرخەكەی سێ سەد هەزار درهەم بوو .

ئەمە ئەو دەوڵەمەنديە بوو كە بەبچووكی لەوەوە دەستی پێكرد كە لە بەخشيندا هەندێك لە موسڵمانان بەسەر هەندێكی ترياندا دەدران ، لەسەردەمی عمر ئەو بەسەر دادانە كە ويستی پووچەڵی بكاتەوە و هەڵی بوەشێنێتەوە وفريای دەرئەنجامەكانی بكەوێت بەڵام ئەو پێكانە پێشی كەوت كە تەنها دڵی عمری نەپێكا ، بەڵكو دڵی ئيسلامی پێكا ـ دواتر زيادی كرد و گەشەی كرد لەبەر ئەوەی عثمان هێشتيەوە ، ئەمە جگە لە دياری و بەخشين و مووچەكان ، دواتر تەشەنەی كرد تەشەنەيەكی زۆر خراپ بە كۆكردنەوەی ماڵ و موڵك و سەرچاوەكانی بەكارهێنانی

---

[٣٧] ناوی ابو حەسەنی كوڕی علی كوڕی حوسەينی المسعودييە ، لە شاری بەغداد لە دايك بووە و لە فستات لە مسر لە ساڵی (٣٤٦ه) وە فاتی كردووە ، ئەم كەسە داكۆكی كارێكی سەرسەخت بووە لە ڕافزە ، ئين تيميە دەڵێت : لە مێژووی المسعوديدا ئەوەندە درۆ هەيە خودا نەبێت كەس ناتوانێت ئەژماری بكات (منهاج السنە النبويە لابن تيميە ٤٧ / ١٠)، وە قازی ابوبكر كوڕی العربی دەڵێت : لە هيچ مێژوو نوسێك شت مەبيسن لە تەبەری نەبێت ، وە بە المسعودی مێژوو نووس دەڵێت : موبتەدعێكی فێڵبازە (العواصم من القواصم ص: ٢٤٨-٢٤٩) ، وە حافز ابن حجر دەڵێت : كتێبەكانی پڕ بەوەی كە دەيسەلمێنن شيعە و موعتەزيلی بووە ( لسان الميزان ٢٢٤/٤_٢٢٥ ) ، وە الزهبی دەڵێت : هەوالگربووە و شتی سەير و سەمەرەی زۆرە و موعتەزليی بووە (سير أعلام النبلاو ٥٦٩/١٥) ،هاوشێوەی ئەم كەسانە كە خاوەن چەندان نووسينە لەوەی كە پێغەمبەر ﷺ دوايی خۆيی وەسيەتی كردووە كە خەلافەت بۆ علی و منداڵەكانی بێت ئايە بەڵگەن بەسەر كەڵە پياوانی وەك عوسمان و عەمر و موعاوييە و هەموو هاوەڵانی تر ؟!.

، کە عثمان حەڵاڵی کردبوو لە کڕینی زەوی لە هەرێمەکان و فراوان بوونی موڵکداری لە ڕووبەرێکی فراوان لەسەر زەوی ، وە بەو بەرەنگاریە ڕاست و خالیص و قووڵەی کە لە دڵی ابو ذر سەرچاوەی گرت ، کە شایستە بوو ئەگەر بە ئامانج گەیشتبا ، وە ئەگەر کاربەدەست گوێی لێگرتبا ، کە ئەو بارودۆخە چاك بکات ، وە ئەوە دەستەبەر بکات کە عمر لە دوارۆژەکانی ژیانیدا ویستی پێی هەستێت کە وەرگرتنی پارەی زیادەی دەوڵەمەندەکان بوو بۆ ئەوەی بەسەر هەژارەکاندا دابەشی بکات ، بەو ڕێ و شوێنانەی کە ڕێگە بە فەرمانڕەوا دەدات بۆ پاراستنی ئوممەت لە زەرەر و زیان ، بەڵکو ئەوەی کە بەرژەوەندی کۆمەڵگە پێویستی دەکات لەسەری .

## باسێکی ناڕەوا لەسەر عثمان(رضي الله عنه) ، و باسێکی تێکدراو لەسەر سەردەمی ئومەوی و عەباسییەکان کە کینە و بوغز و نکولی لێدەبارێت بۆ باڵادەستی ئیسلام و بەهێزی و ڕێز و هێزی خەڵکەکەی لە باشترینی سەردەمەکان

سەییدقوتب دەڵێت (ل ١٧٥ ـ ١٧٦) : ( لە کاتێکدا کە ماڵ و سامان کۆدەکرایەوە و فراوان دەبوو لە لایەك ، لە بەرامبەردا هەژاری و دەست نەچوونی و ڕازی نەبوون و تورە بوون باڵی بەسەر خەڵکدا کێشابوو ، ئەوە زۆری نەخایاند کە کۆبوونەوە و گەورە بوون ، کە فیتنەیەکی شەپۆلدار سەری هەڵدا ، کە دوژمنانی ئیسلام بەکاریان هێنا و قۆستیانەوە ، کە لە کۆتاییدا ژیانی عثمانی تیابرد ، کە لەگەڵ خۆیدا ئاسایش و سەلامەتی ئوممەتی برد ، وە بەخشییە تەنگوچەڵەمە و پاشاگەردانی کە پاشخانی مایەوە کە بە تەپودوکەڵی ڕۆحی ئیسلامی داپۆشی ، وە ئوممەتی دایە دەستی پادشاگەلی ستەمکار و ناڕەوا .

لەبەر ئەوە ناوازە نەبوو کە خاوەن سەرمایەکان ، وە ئەو سوودمەندانەی بەخت و بەشێکی باشیان هەبوو لە بەخشینەکان تورەبن ، لە سیاسەتی یەکسانی دادپەروەری کە عەلی ویستی پیادەی بکات دوای عثمان ، وە وایان دەردەبڕی کە ئامۆژگاری دەکەن بەوەی لەو سیاسەتە دووركەونەوە بەبیانوی ئەوەی لە لێك ترازانی کۆمەڵگە دەترسن ، وەڵامی ئەوە بوو لە ویژدانێکی بەهێزەوە کە ڕۆحی ئیسلام ئیلهامی پێبەخشی بوو وتی : داوام لێدەکەن بەستەم سەربکەوم بەسەر ئەوانەی بووم بە فەرمانڕوایان ؟ ئەگەر ئەم ماڵ و سامانە هی خۆم بوایە بە یەکسانی دابەشم دەکرد لە نێوانیان ، چۆن وانەکەم لە کاتێکدا کە ماڵی خودایە ؟ بزانن بەخشینی ماڵ بە کەسێك کە مافی نەبێت بەفیرۆدان و زیادەڕۆیکردنە ، ئەوە دەبێتە مایەی بەرزبوونەوەی خاوەنەکەی لە دونیا و تیاچوون و ڕیسوابوونی لە دوارۆژدا .

بەڵام ئومەویەکان لە سیاسەتی ماڵ و ساماندا لەوە جیاواز بوون ، تا عومەری کوڕی عبدالعزیز هات و ئەوەی کرد کە پێشتر باسمانکرد لە گەڕانەوەی ماڵە بەستەم براوەکان ، وە ئەو بەتاڵان بردنەی ماڵی موسڵمانانی گرتەوە کە بە ناڕەوا دەبران ، هیچ بۆ ئومەویەکان نەبوو ئەوە نەبێت کە بۆ هەموو خەڵك بوو ، وە ماستاوچی و ئارەزووبازان هیچ بەشێکیان پێنەدەدرا ، وە ئەوەی کە بە شاعیرەکان دەدرا لەبەر پیاهەڵدان گرتیەوە و بێبەشی کردن ، و هیچی پێنەدەدان لە(بیت المال).

دواتر باسی سەردەمی عومەری کوڕی عبدالعزیز دەکات و دەڵێت : ( هەژاری و دەست نەڕۆیشتن دەرئەنجامی هەڵئاوسان و زیادبوونی ماڵە ، وە هەژارەکان لە هەموو کاتێکدا قوربانی دەوڵەمەندە پاوانخوازە چاوچنۆکەکانن کە زۆر کات لە ئەنجامی بەخشین و دەرەبەگایەتی و ستەم و قۆرغکاریەوە دێت !

وە لەسەردەمی ئومەوییەکان و عەباسیەکانی دوای ئەوانیش (بیت المال) والآ و لەسەرپشت بوو بۆ پادشاکان وەك ئەوەی موڵکی تایبەتی خۆیان بێت ، ئەوە سەرەڕای هەبوونی دوو سەرچاوەی دارایی کە ماڵی گشتی و ماڵی تایبەت بوون ، کە یەکەمیان وا پێویست بوو کە داهات و خەرجیەکانی بۆ هەمووان بێت ، وە دووهەمیان داهات و خەرجیەکانی لە ماڵی تایبەتی کاربەدەستان بێت ، بەڵام هەندێك جار دەبینین کە ماڵی گشتی دەگوازرێتەوە بۆ ماڵە تایبەتەکان و خەرجیە تایبەتەکانیش لە ماڵی گشتی دەدرا !

لە کتێبی (الحضارة الإسلامية في القرن الرابع الهجري) ی (آدم میتز) دا هاتووە کە محمد عبدالهادی ابو ریده وەرگێڕاوە : بەخشینەکان و ئەو خەرجیانەی کە پەیوەندی بە کۆشکی خەلافەتەوە هەبوو لە ماڵی گشتی دەدران ، وە نوسراوێکمان لایە کە دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای سەدەی چوارەم کە بوارەکانی خەرج کردنی ماڵی لە خۆگرتووە کە دەبرا بۆ ماڵی تایبەت :

١.ئەو ماڵە جیاوازانەی کە باوکان بۆ منداڵەکانیان بەجێ دەهێشت لە (بیت المال) ، وە دەوترێت : کە الرشید گەورەترین سەرمایەی لە دوای خۆی بەجێ هێشتووە کە بڕەکەی چل و هەشت ملیون دینار بووە ، وە معتضد (٢٩٧ ـ ٢٨٩ك) هەموو ساڵێك لەساڵەکانی دەسەڵاتەکەی یەك ملیۆن دیناری پاشەکەوت دەکرد دوای خەرجیەکانی هەتا نۆ ملیۆن دیناری پاشەکەوت کرد لە خەزێنە تایبەتەکەی خۆی ، وە ویستی کاملی بکات بیکاتە دە ملیۆن دینار بۆ ئەوەی بیکات بەیەك پارچە خشلێ ، وە نەزری کردبوو ئەگەر سەرمایەکەی گەیشتە ئەو ئاستە سێیەکی باجی ئەو ساڵە لە خەڵکی وڵاتەکەی وەرنەگرێت وە ویستی ئەو خشڵە لەسەر ڕێگەیەکی گشتی دابنێت بۆ ئەوەی دەوروبەری بزانن دەملیۆن دیناری هەیە و ئیشی پێی نییە ، مردنی پێگەیشت پێش ئەوەی بگاتە ئاواتەکەی ، دوای معتضد ، مکتفی هات (٢٨٩ ـ ٢٩٥ ك) ئەو ماڵە وەلانراوەی گەیاندە چواردە ملیۆن دینار .

٢.ماڵی خەراج و موڵکی گشتی کە لە کرێکارەکانی فارس و کرمانەوە بۆی هات ( دوای لادانی خەرجیەکان ) .

**ئیدی ئەو چەواشەکاریانەی درێژە پێدەدات بەسوود وەرگرتن لە وتەکانی آدم میتز .**

**بەو شێوازە سید قوتب تانەکانی ئاڕاستەی هاوەڵان و تابیعیەکان و سەردەمی ئەمەوی و عەباسی دەکات ، وە تێیدا ڕۆدەچێت و گەورەی دەکاتەوە و نازانین چی هێشتووەتەوە بۆ ئیسلام و موسڵمانان لە شانازی بەوسەردەمە چاکانەوە کە سەردەمی پرشنگدار و بەهێزی ئیسلام و ڕزگارکردنە گەورەکان بوو .**

**تانە دانی لە موعاویە و عەمر وە ئەوانەی لەسەردەمی ئەواندا بوون وە ڕۆچوونی لە عەلی (رضي الله عنه)**

سید لە کتێبی (کتب وشخصیات)(ل٢٤٢ ـ ٢٤٣) دا دەڵێت : ( موعاویە و عەمری هاوڕێی سەرنەکەوتن بەسەر عەلی دا لەبەر ئەوەی کە شارەزاتربوون بە دەروونی خەڵك ، و لێزان تربن بە هەڵسوکەوتی شیاو لە کات و شوێنی پێویستدا ، بەڵکو ئەوان ئازاد بوون لە بەکارهێنانی هەموو چەك و ئامرازێك ، وە ئەویش وابەستەی ڕەوشت و ئاکاری بوو لە هەڵبژاردنی ئامرازەکانی کێشەی نێوانیان ، وە کاتێك موعاویە و هاوڕێکەی مەیلیان دایە درۆ و گزی و فێڵ و دووڕووی و بەرتیل دان و کەسایەتی کڕین ، و عەلی نەیتوانی دابەزێتە ئەو ئاستە ڕیسواییە ، ئیدی سەرسوڕهێنەر نییە کە ئەوان سەرکەون و ئەمیش نوشوست بهێنێت ، نوشستێك کە باشترە لە هەموو سەرکەوتنێك .

سەرکەوتنی موعاویە بەسەر عەلی دا ، لەبەر چەند هۆکارێك بوو کە لە هەردووکیان گەورەتر بوو : سەرکەوتنی نەوەیەك بوو بەسەر نەوەیەکدا ، وە سەردەمێك بەسەر سەردەمێکدا ، وە بۆچوونێك بەسەر بۆچوونێکدا ، ئەو کات هەڵکشانی ڕۆحی بەرز و بڵندی ئیسلامی لە داکشاندا بوو ، وە زۆرێك لە عەرەب هەڵگەڕابوونەوە بەرەو ئەو هەڵدێرەی کە ئیسلام دەریهێنابوون لێی ، لە کاتێکدا عەلی لە لوتکەدا مایەوە و شوێنی ئەم داکشانە نەکەوت ، سەرنەکەوتن و نوشوستی لەوە سەرچاوەی گرت ، ئەوە سەرنەکەوتنێکە کە لە هەموو سەرکەوتنێك باش و ویستراوترە .

لێرەدا دەگەینە تێبینی چوارەم : کە دەبینین نوسەر خۆشحاڵە بە ڕۆحیەتی قازانج خوازی لە سیاسەتدا ، و بە خاوەنەکانیدا هەڵدەدات ، وە دان نانێت بە جگە لە سەرکەوتنی کرداری ئەگەرچی لەسەر لاشەی نمونەی بەرز و ڕەوشتیش بێت ) .

دواتر درێژە بە وتەکانی دەدات دەڵێت :

( سەرکەوتنی موعاویە گەورەترین کارەسات بوو کە ڕۆحی ئیسلامی ژێر پێکرد کە ئیدی نەیتوانی دەروونەکان بگرێتەوە ، وە ئەگەر قەدەر بووایە عەلی سەربکەوتایە ئەو کات سەرکەوتنەکەی سەرکەوتنی ڕاستەقینەی ڕۆحی ئیسلام بوو : ئەو ڕۆحەی کە ڕەوشتی دادوەرانەی باڵابوو کە کارت و چەکە قێزەونەکانی لە تێکۆشاندا بەکارنەدەهێنا ، بە دۆڕانی ئەم ڕۆحییەتە نیو سەدەی تەواو نەکرد کە تیاچوو و وەهیچ هێما و ئاماژەیەکی بوونی نەما ـ چەند ساڵێکی کەم نەبێت لەسەر دەستی عومەری کوڕی عبدالعزیز ـ دواتر ئەو چرای ڕووناکیە کوژایەوە ، و تەنها شتە شەکڵی و ڕواڵەتیەکان مانەوە لە ڕۆحی ئیسلامی ڕاستەقینە .

بناغەی ئیسلام دانرا لەسەر دەستی موعاویە و ئەوانەی دوای ئەو هاتن فراوانکرا ، بەڵام ڕۆحی ئیسلام هاتەوەیەك ، و دۆڕا ، بەڵکو کوژایەوە .

ئەگەر مرۆڤ ئاسودە بێت بە دۆڕانی ڕۆحی ئیسلامی ڕاستەقینە لە سەرەتاکانیدا ، وە کوژانەوەی مەشخەڵی بە بەرپابوونی پادشاگەری ستەم و ناڕەوا ... ئەوە هەڵەیەکی دەروونی و ڕەوشتیە کە گومانی تێدا نییە .

ئێمە ڕۆژێك لە ڕۆژان پێویستمان بەوە نییە کە خەڵك بانگ بکەین بۆ پلانەکانی موعاویە ، ئەوە بەشێکە لە سروشتی گشتی خەڵك ، بەڵکو ئێمە پێویستمان بەوەیە خەڵك بانگ بکەین بۆ پلانەکانی عەلی ، ئەمە ئەوەیە کە پێویستی بە دەروون بەرزی هەیە کە زۆرێك خەڵك ماندوو دەبن بۆ ئەوەی پێی بگەن .

وە ئەگەر نەوەیەك پێویستی کرد بانگ بکرێن بۆ پلانەکانی موعاویە ، ئەوە ئەو نەوەیە نییە کە ئێستا بوونی هەیە بە شێوەیەکی گشتی ، ڕۆحی ـ میکاڤیلی ـ کە زاڵ بوو بەسەر موعاویەدا پێش چەند سەدەیەك پێش میکاڤیلی ، ئەو ڕوحیەتە ئێستا زاڵە و باڵی بەسەر ئەم نەوەیەدا کێشاوە ، ئەوان شارەزاترن لەوەی کە یەکێك بانگەوازیان بکات بۆی ! چونکە ئەوە ڕۆحی ـ قازانج ویستیە ـ کە تاك و کۆمەڵگە و ئوممەت و حکومەتەکانی گرتووەتەوە !

دواتر من شیعەنیم[٣٨] کە ئەم وتەیە پشتڕاست بکەمەوە ، بەڵام من سەیری ئەو پرسە لە ڕوانگەی ڕۆحی و ڕەوشتیەوە دەکەم ، مرۆڤ پێویستی بەوە نییە کە شیعە بێت بۆ ئەوەی ڕەوشت و ئاکار سەربخات کە دوور بێت لە هەلپەرستی دابەزیوی سووک و بێنرخ ، وە عەلی سەربخات بەسەر موعاوی و عەمر دا، بەڵکو ئەوە سەرخستنی بەرزی و پاکی و بەردەوامیە ).

**ئەم کەسە دوای هەموو ئەوتانانە کە زۆرێك لە شیعە شەرم دەکەن بەڵکو بە حەرامی دەزانن دەیەوێت لە تۆمەتی شیعە بوون دەربازی بێت ، بەڵام ئەوەی ڕێزی هاوەڵانی محمد ﷺ بگرێت ، حوکمی ڕەفزی پیس دەدات بەسەر ئەو کەسەی تەنها لە شان و شکۆی یەکێك لە هاوەڵانی محمد ﷺ کەم بکاتەوە چجای کەسێك کە حوکمی ئەوەبدات بەسەر زۆرێك لە هاوەڵان و تابعیەکان کە هەڵگەڕانەوە بۆ ئەو هەڵدێرەی کە ئیسلام دەریهێنابوون لێی.**

=====================



---

(٣٨) [بەڵکو لە شیعە خراپتر بیدعەکان دەهۆنیتەوە ] (م.خليل أحمد).